مامۆستای محەمەد فاتیح

# مەلا گۆرانی شارەزووری

داڕێژەرو فریادڕەسی فەتحی قوستەنتینیە (ئیستەمبۆڵ)

# مامۆستای محەمەد فاتیح (مەلا گۆرانی شارەزووری)
# دارێژەر و فریادڕەسی فەتحی قوستەنتینیە (ئیستەمبۆڵ)

............................................................................................................................

لەبڵاوکراوەکانی ناوەندی هزیی و ڕۆشنبیریی خاڵ (١١)

- نووسینی: دیدارعوسمان / شەیما ڕۆستەم
- بابەت: لێکۆڵینەوە
- دیزاین: ڕەوشت محەمەد
- نۆبەی چاپ: یەکەم
- چاپخانە: هێڤی

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٢٣)ی ساڵی ٢٠١٧ پێدراوە

قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم)

(لَتُفْتَحَنَّ الْقُسْطَنْطِينِيَّةُ فَلَنِعْمَ الآمِيرُ اَمِيرُهَا وَلَنِعْمَ الْجَيْشُ ذَلِكَ الْجَيْش)

رواه احمد

## ناوەرۆك

## کرۆنۆلۆجیایی ژیانی مەلا گۆرانی و گرنگترین ڕووداوەکان:

له دایکبوونی ........................................ ٨١٣ کۆچی – ١٤١٠ زاینی

قۆناغی دەسپێکردنی خوێندن .......................... ٨٢٠ ك – ١٤١٦ – ١٧

چوونی بۆ شاری حەسەن کێف ............................ ٨٢٦ ك – ١٤٢٢–٢٣

ڕووکردنە شام .............................................. ٨٣٠ ك – ١٤٢٦–٢٧

ڕووکردنە قودوس ........................................... ٨٣٣ ك – ١٤٢٩ – ٣٠

ڕووکردنە قاهیرە لای ئیبن حەجەر درێژە بە خوێندن دەدات... ٨٣٥ ك – ١٤٣١ – ٣٢

کێشەی لەگەڵ حەمیدەدین نوعمان ............................ ٨٤٤ ك – ١٤٤٠

سەرەتایی ئاشنایەتی بە مەلا یێگان و چوونی بۆ ئەنەدۆل ............ ٨٤٥ ك –١٤٤١

مامۆستایەتی لە شاری بۆرسەی پایتەختی عوسمانی .......... ٨٤٦ ك – ١٤٤٢–٤٣

گۆرینی مەزهەبی لە شافیعیەوە بۆ حەنەفی ........................ ٨٤٦ ك –١٤٤٣

بوونی بە مامۆستایی تایبەتی محەمەد فاتیح ............... ٨٤٧ ك – کۆتایی ١٤٤٣

بەشداریکردنی لە کۆبونەوکانی محەمەد فاتیح .................... ٨٥٥ ك – ١٤٥١

ڕۆڵی لە فەتحی قوستەتینیە .................................. ٨٥٧ ك – ١٤٥٣

کۆچکردنی بۆ قودس و حیجاز ................................ ٨٥٩ ك – ١٤٥٥

دەسپێکردن بە نووسینی تەفسیری قورئانی پیرۆز .................. ٨٦٠ ك – ١٤٥٦

جێهێشتنی قودس و نیشتەجێبوونی لە بۆرسە بۆ جاری دووەم ..... ٨٦٢ ك – ١٤٥٨

تەواو کردنی تەفسیری قورئانی پیرۆز (غایات و ألامانی ) ............ ٨٦٧ ك –١٤٦٣

کردنەوەی مزگەوتی وەفا (مزگەوتی مەلا گۆرانی ) ................. ٨٦٧ ك –١٤٦٣

بونیادنانی قوتابخانەکان ........................................ ٨٦٧ ك –١٤٦٣

بونی بە شەیخولئسلام و موفتی گشتی ............................ ٨٨٥ ك –١٤٨٠

کۆچی دوایی محەمەد فاتیح ...................................... ٨٨٦ ك – ١٤٨١

بەشداری کردنی لە کۆبونەوەکانی بایەزیدی دووەم .............. ٨٨٦ ك –١٤٨١

وەفاتی مەلا گۆرانی ............................................. ٨٩٣ ك –١٤٨٨

# پێشەکی

## بەشداری کورد لەگۆڕینی مێژووی مرۆڤایەتیدا نەزانراوە

ئەم پەرتوکەی لەبەر دەستمانە باس لەبابەتێکی گرنگی پڕ بایەخ دەکات، ژیانی کەسایەتیەکی کورد کەبەڕادەیەکی زۆر بەشداربووە لەفەتحی قوستنتینیەدا لەساڵی (١٤٥٣)دا، کەئەو فەتحە لەلایەن مێژووناسانەوە لەرۆژئاوا بەسەرەتای سەدەی نوێ و کۆتایهاتنی سەدەکانی ناوەڕاستیان دانراوە، کوردیش لەڕێی رۆڵی مەلا گۆرانی ئاراستەکارو پەروەردەکاری سولتان محەمەد فاتیحەوە رۆڵێکی بەرچاویان هەبووە لەم ڕووداوە مێژووییەدا. بەشداری کردنەکانی کورد لەکاریگەری لەسەر رەوتی مێژووی مرۆڤایەتی لەسەرەتاوە لەوانەیە وەك کارێکی زیادەڕەوی تێداکراو دەربکەوێت، چونکە کورد لەئەمڕۆدا بەشێوەیەکی گشتی گەلێکی ستەم لێکراوەو وڵاتەکەی بەشەبەش کراوەو گەلەکەی بەدەست چەوسێنەرانەوە دەناڵێنێت و ژێرخانی ئابووری ورۆشنبیری کۆمەلگاکەی پێشکەوتوو نیە، بەڵام بەقوڵبوونەوەو ڕامان دەگەینە ئەو باوەڕەی کەبەڵێ کورد وەك نەتەوەکانی تر بەشداری کردووە لەگۆڕینی رەوتی شارستانێتی مرۆڤایەتیدا.

خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموویێت: ((وَقِيلَ يَا أَرْضُ ابْلَعِي مَاءَكِ وَيَا سَمَاءُ أَقْلِعِي وَغِيضَ الْمَاءُ وَقُضِيَ الأَمْرُ وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ وَقِيلَ بُعْدًا لِلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ)) – سورەتی هود ئایەتی ٤٤–، نیمچە

کۆدەنگییەك لەنێو زانایانی شارستانیەتی ئیسلامیدا هەیە کەچیای جودی کەگەشتیەکەی گەورەمان نوح سەلامی خوای لەسەر بێت لەسەری راوەستاوەو لەوێوە مرۆڤایەتی بەرەو بونیاتنانی شارستانیەتی مرۆڤایەتی هەنگاوی هەلگرتووە چیایەکە لەباکووری کوردستان کەلەئەمڕۆدا دەکەوێتە باشووری رۆژهەلاتی تورکیا، کەواتە خاك و خەلکی کوردستان لەلایەن خوای میهرەبانەوە موبارەك کراوە بۆ سەرکردایەتی مرۆڤایەتی لەبونیاتنانی شارستانیەتێکی پێشکەوتووتر لەشارستانیەتی سەرەتایی کەشارستانیەتی کۆبوونەوەو ژیان لەدارستان و ئەشکەوتەکەکاندا بووە بەرەو شارستانیەتی نیشتەجێبوون لەخانوو بەکارهێنانی ئامێرە کشتوکالییە پێشکەوتووەکان وسوود وەرگرتن لەئاو بەشێوەی زانستی پێشکەوتووتر لەبواری ئاودێری و کشتوکالداو، یەکەمین دەرکەوتەکانی پیشەسازی مرۆڤایەتیش لەدروستکردنی قاپ و دەفری ڕازینراو لەگوندەکانی کوردستاندا دەرکەوت وەك ئەوەی کەلەئەشکەوتی هەزارمێردو ئەشکەوتی شانەدەرو چەرموودا هەبووە، زانایانی شوێنەوارناسی ئەمڕۆ گەواهی دەدەن کەکوردستانی ئەمڕۆ لانکەی شارستانیەتی مرۆڤایەتی بووە، هەرئەمەش وایکردووە کەنووسەری بەریتانی (دبلیو. ا. ویگرام) کتێبەکەی ناو بنێت (کوردستانی رۆژهەلات لانکەی شارستانیەت).

سەلاحەدینی ئەیوبیش لەگۆڕانی ئاراستەی پەیوەندییەکانی نێوان رۆژئاواو رۆژهەلاتدا بەسەرکەوتنەکانی لەجەنگەکانی دژی خاچپەرستیدا بەرۆلی خۆی هەستاوە، لەمبارەیەوە فلادیمێر مینۆرسکی لێکۆلەری روسی

و زانـای پـسپۆڕ لــەکاروباری ئێـران و کـورددا لەکتێبەکەیـدا سـەبارەت بەسەلاحەدەین باسی ئەوەی کردووە کەشکستی خاچپەرستەکان لەسـەر دەسـتی سـەلاحەددینی ئـەیوبی کاریگـەری زۆری هـەبووە لەسـەر رەوتـی رووداوەکان لەناوخۆی ئەوروپاداو تەختی شـاهانەی بـەریتانیاو فەڕەنـساو ئیمپراتۆریەتی نەمساو ئەڵمانیای لەرزاندووە.[1]

لـەدوتوێی ئـەم پەرتووکـەدا مامۆسـتایان (دیـدار عوسمـان و شـەیما رۆسـتەم) بـاس لـەژیانی ئەحمـەدی کـوڕی ئیـسماعیلی کـوڕی عوسمـانی گـۆرانی شـەهابەدینی شـافعی دەکـەن (٨١٣ك ١٤١٠ز– ٨٩٣ك ١٤٨٨ز) دەکـەن کەخـەڵکی شـارەزوور بـووە لـەپارێزگای هەڵەبجـە لەهـەرێمی کوردستانی ئێستا، ئەم زانایایـە یەکێکـە لـەزانا پایـەدارەکان کەبەشـداری نایابی لەشارستانیەتی ئیسلامیدا هەیە، زانایەکی مەوسوعی بووە، چـونکە وەك موفەسیرێکی رۆشـنبیری و موحەدیـسێکی بـوێرو فـەقیهێکی لێهـاتوو ناسراوە، دانراوە زانـستیەکانی شـوین پەنجـەییان لـەزۆر لایەنـەوە لەسـەر شارستانیەتی ئیسلامی بەجێهێشتووە، لەئەمڕۆدا بەدەیان نامـەی زانـستی لەئاسـتی ماسـتەرو دکتـۆرا سـەبارەت بـەم زانایـە لـەجیهانی ئیـسلامیدا نووسـراوە، لـەتورکیاش شـوینی نیـشتەجێبوون و وانەوتنـەوەی کراوەتـە جێگای شوێنەواری و چەندین دامەزراوەی وەقفی بەناویەوە هەیە.

زۆرێك لەوانەی سەبارەت بەژیانی نوسیوویانە باسیان لەوە کردووە کـە موڕادی دووەمی سوڵتانی عوسمـانی بـەزانایی و کەسـێتیە زانـستیەکەی و

---

[1] بڕوانە:
V. Minorsky , Prehistory of Saladin A.D. 1138-1193 in Studies in Caucasian History (London, 1953.

کاریگەربوونی سەرسام بووە، لەبەر ئەوە پەروەردەکردن و پێگەیاندنی سولْتان محەمەد فاتیحی کوڕی کەبووە رزگارکاری قوستەنتینیە پێسپاردووە، میژوونووسانی ژیانی سولْتان محەمەد فاتیح باس دەکەن کەمەلا گۆرانی بووە هانی سولْتان محەمەد فاتیحی داوەو سووربووە لەسەر ئەوەی قوستەنتینیە رزگار بکات و گۆرانیش قازی سەربازی ئەو سوپایە بووە کەبەرەو ئەستنبولْ رۆشت، وەك رێزێك لەو ئامۆژگاری و رێنماییانە محەمەد فاتیح بەپۆستی وەزیر لەدەسەڵاتەکەیدا پاداشتی دایەوە بەڵام مەلا گۆرانی رەتی کردەوە، هەمووان دانیان ناوە بەپاکی و کەسێتی زانستیداو ئەوەبوو دواتر کرایە شێخلئیسلامی دەولْەتی عوسمانی لەسەردەمێکیدا کەدەولْەتی عوسمانی لەترۆپکی بەهێزیدا بوو.

ئەم دوو مامۆستایەی نووسەرانی ئەم پەرتووکە بەم کارەیان کەهاتوون لە ژیانی زانایەکی کوردو ناودارێك لەهەرە ناودارانی شارستانیەتی ئیسلامییان کۆڵیوەتەوە کەلای نەوەی کوردستانی هاوچەرخی ئەمڕۆمان نەناسراوە خزمەتێکی زانستیان پێشکەشی کتێبخانەی کوردی کردووە کەم نیە، بەڕاستیش دەستکەوتێکی زانستی گەورەیە بۆ دوو لێکۆڵەری گەنج، کەبەشێوازێکی ڕوون و ئاسان بابەتەکەیان بۆ خوێنەر خستۆتە ڕوو کەلەهەمان کاتدا شێوازی زانستی وردیان پەیرەو کردووەو لێکۆڵینەوەکەیان بەسەرچاوە عوسمانی و تورکی و عەرەبیەکان دەولْەمەند کردووە.

بەوپێیەی کەملا گۆرانی زانایەکی پایەدار بووە لای زۆرێك لەبەرپرسانی دەولْەتی عوسمانی ئەمەش وایکردووە ئیرەیی و رق و کینەی لەلایەن

هەندێك كەسەوە بەرانبەر دروست ببێت و پڕپاگەندەی لەدژ بکەن و گوایە ئەمەش وایکردووە کەسوڵتان محەمەد فتیح لەخۆی دووربخاتەوە، هەردوو مامۆستا دیدار وشەیما بەلێهاتوویيەکی زۆری زانستیەوە لەوە درۆو هەڵبەستراوانەیان کۆڵیوەتەوەو بەپشت بەستن بەبەڵگەنامەکانی عوسمانی و کتێبەکانی زانایانی هاوچەرخ لەبارەی مەلا گۆرانی وەڵامی ئەوەیان داوەتەوە، ئەمەش دەستکەوتێکی زانستییە بۆیان و ڕاستکردنەوەی ئەو هەڵانەیە کەسەبارەت بەژیانی زانایەکی پایەرز لەزانایانی شارستانیەتی ئیسلامی کراوە، خۆزیا ئەم کتێبە وەردەگێڕدرا بۆ سەر زمانی تورکی و عەرەبی. هەروەها ئەم پەرتوکە دەستکەوتێکە بۆ کورد چونکە نووسەرانی گەلانی دیکەش هەبوون هەوڵیانداوە کەئینتیمای نەتەوەیی ئەم کەسێتیە لێهاتوو بلیمەتە بشارنەوە، نووسەرانی ئەم کتێبە وەڵامی ئەو بۆچوونە دەمارگیرانانەیان داوەتەوە کەهەوڵیان داوە توانای گەلەکەمان لەپێشکەشکردنی زانست و زانیاریدا نادیدە بگرن.

لەکۆتاییدا دەڵێم:ئەم هەوڵە زانستییە سادەیەی مامۆستایان دیدارو شەیما بۆ دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردی هیچی کەمتر نیە لەهەوڵەکانی مامۆستایانی بەڕێزی وەك دکتۆر محەمەد عەلی و محەمەد ئەمین زەکی لەدەرخستنی ڕووی شارستانی گەلی کوردستاندا.

**دکتۆر عوسمان عەلی**

**دکتۆرا لەزانکۆی تۆرینتۆ لەکەنەدا**

**مامۆستای بەشدار، لەزانکۆی سەلاحەددین لەهەولێر**

# ١,١:بەشی یەکەم:

## ١. ٢:ناو و نازناوی مەلا گۆرانی:

سەبارەت بە ناو و نازناوی مەلا گۆرانی بۆچوونی جیاواز هەیە، بەڵام هەموو بۆچوونەکان تا ئەندازەیەکی باش لە یەکترەوە نزیکن، خۆش بەختانە ئێمە لەگەڵ (بەڵگەنامەکانی عوسمانی) پەرتووکی کۆمەڵێك لە هاورێ و مامۆستاکانی مەلا گۆرانیمان بۆ بەجێماوە، کە بەشێکیان لە سەردەمی خۆی، بەشێکی تریشیان بە ماوەیەکی کەم دوای مردنی نووسراون، کە ئەمانەش یارمەتیدەرێکی باشن، بۆ ئەوەی ئاسانتر لە ناو و نەسەبی مەلا گۆرانی بگەین. ئیمامی سیووتی لە پێناسەی مەلا گۆرانی وا دەنوسێت:(ئەحمەد کوڕی ئیسماعیل کوڕی ئەحمەد)، نازناوەکەی بە (شەهابەدین گۆرانی ) هێناوە [١]، ئیمامی مەقریزی کە هاوسەردەمی مەلا گۆرانی بووە، نووسویەتی گۆرانی ناوی (ئەحمەد کوڕی ئیسماعیلی کوڕی ئەحمەدی کوڕی رەشیدی کوڕی ئیبراهیم کوڕی شەرەفەدینە) زۆر نازناوی هەبووە وەك:شەهابەدین، شارەزووری، گۆرانی، هەمەدانی، شافعیی. [٢]

---

[1] جلال الدين السيوطي المتوفى: ٩١١هـ: نظم العقيان في أعيان الأعيان ، فيليب حتي ، ١٩٢٧ ، المكتبة العلمية – بيروت ، ص ٣٨.

[2] أحمد بن علي المقريزي تقي الدين ٨٤٥ توفي : درر العقود الفريدة في تراجم الأعيان المفيدة ، إحياء التراث العربي / وزارة الثقافة، سوريا ١٩٩٥ مجلد ١ ، ص ٣٦٣.

خاوەنی پەرتووکی (معجم المؤلفين ) سەبارەت بە باپیرانی مەلا گۆرانی جیاواز تر ناوی هێناو، بەم شێوەیە (ئەحمەد کوڕی ئیسماعلی کوڕی عوسمانی کوڕی ئەحمەدی کوڕی رەشیدی کوڕی ئیبراهیمە) چوار نازناوی (شارەزووری، هەمەدانی، تەبریزی، گۆرانی ) بۆ ژماردووە، لە دواتر بە شەرەفەدین، شەهابەدین کۆتایی هێناوە [١]. (ئیبن حەجەر عەسقەلانی) کە مامۆستا و هاوسەردەمی مەلا گۆرانی خۆیەتی جیاوازتر لە هەموو سەرچاوەکان ناوی باوکی مەلا گۆرانی بە (یوسف) هێناوە، لەگەڵ ئەوەی ناوی مەلا گۆرانی خستۆتە نێوان دوو نازناوی (شەهابەدین) لە سەرەتا و (گۆرانی) لە کۆتایی[2]. مێژوونووسی ناوداری بەرەچەلەك کورد لە دەوڵەتی عوسمانی، ئیسماعیل پاشای بەغدادی لە پەرتووکە بەناوبانگەکەی هدية العارفين وأسماء المؤلفين وآثار المصنفين، سەرەڕای ئەوەی ناوی باوکی گۆرانی بە (ئیسماعیل) هێناوە، هەروەها دوو نازناوی لە کۆتایی ناوی مەلا گۆرانی هێناوە، بە ناوی (شەمسەدین گۆرانی)[٣].

---

[1] عمر بن رضا بن محمد راغب بن عبد الغني كحالة الدمشق (المتوفى: ١٤٠٨هـ) : معجم المؤلفين ، مكتبة المثنى – بيروت، دار إحياء التراث العربي بيروت ' ص ١٠٤، عمر رضا كحالة : المنتخب من مخطوطات المدينة المنورة : مكتبة عارف حكمت ، المنتخب تم نشره عبر ٦ أعداد من مجلة مجمع اللغة العربية بدمشق ، خصص الجزء الأخير للمكتبة المحمودية . ٢٠١١ ، ص ٧٧–٧٨.

[2] أحمد بن علي ابن حجر العسقلاني (٧٧٣ – ٨٥٣ ه) إنباء الغمر بأنباء العمر، المحقق: حسن حبشي الجزء الرابع ، القاهرة ١٩٩٨ ، ص ١٥٨.

[3] اسماعيل باشا البغدادي (١٩٢٠ م).: هديه العارفين اسماء المؤلفين و اثار المصنفين ، طبعه استانبول سنه ١٩٥١ ، ص ١٣٥.

حاجی خەلیفە نووسەری پەرتووکی (کشف الظنون عن أسامي الكتب والفنون ) لە چەند شوێنێکی جیاواز باس لە ناو و نازناوی مەلا گۆرانی دەکات، بۆ نموونە لە بەرگی یەکەم ناوی گۆرانی بە (ئەحمەدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی محەمەد دێنێت، لەگەڵ نازناوی گۆرانی[1]، بەڵام لە شوێنێکی تر نازناوی شەهابەدین لە سەرەتای ناوی گۆرانی دادەنێت و لە کۆتاییشدا گۆرانی، [٢] ئەمە جگە لەوەی لە شوێنێکی تر، کە بە نازناوی (شەمسەدین) و (ئەبو لعەباس) ئاماژەی پێکردووە[٣]. دواتر ناو و نازناوەکەی مەلا گۆرانی ئاسایی دەبێتەوە بە (ئەحمەد ئیسماعیل گۆرانی).[٤]

ڕەنگە باشترین پەرتووکێك، کە بۆ ئەوەی زیاتر لە دروستی ناو و نازناوەکەی مەلا گۆرانی بگەی ئیمامی بیقاعی بێ؟ چونکە ئەم لە سەردەمی مەلا گۆرانی ژیاوە و چەند جارێك دیدەنی کردووە، سەرەڕای دووپاتکردنەوەی ناوی گۆرانی بە ئەحمەدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی عوسمان، نازناوەکەی هەر بە سەریەکەوە بە ناوی (شەهابەدین

[1] حاجي خليفة : كشف الظنون عن أسامي الكتب والفنون ، محمد شرف الدين يالتقايا ، الناشر: دار إحياء التراث العربي ببرۆت ، جلد ١ ، ص ٥٥٣.

[2] حاجي خليفة : ص ٥٩٦.

[3] حاجي خليفة : ص ٦٤٦.

[4] حاجي خليفة : ص ٨٩٩ جلد ٢ ١٤٨٦، ١٣٧١، ١١٩٠، ١٠٢٢.

گۆرانی) هێنـاوه.[1] (الطبقـات الـسنية في تـراجم الحنفيـة)ش هـەمان بـۆ چوونی بیقاعی دووپات دەكاتەوە[2].

سـەخاوی جیـاوازتر لـە نووسـەرەكانیتر، هـەوڵی داوە هـەموو نـاو و نازناوەكانی گۆرانیمان بۆ گوازێتەوە بۆیە سەرەڕای ئەوەی نـاوی گـۆرانی بە (ئەحمەدی كوڕی ئیسماعیلی كوڕی عوسمـان كـوڕی ئەحمـەدی كـوڕی رەشیدی كوڕی ئیبراهیمی شەڕەفەدین ) هێناوە، گومان لـە نـاوی بـاوكی گۆرانی دەكات، كە (ئیسماعیل) بیت بەڵكوو دەڵێت رەنگـە (یوسـف) لـە پێش (ئیسماعیل)ەوە بێت،وا گومان دەبەین ئـەم بـۆ چـوونەی سـەخاوی پشت بەستنی بە ئیبن حەجەر بێت، هاوكات كۆمەڵێك نازناو بۆ گۆرانی ریز دەكـات وەك دەڵـێ:(شـەهابەدینی شـارەزووری هەمـەدانی تـەبریزی گـۆرانیی)[3]. ئیمـامی شـەوكانی لـە بـارەی نـاوی گۆرانییـەوە هـەمان بۆچونەكەی سەخاوی دووپات دەكاتـەوە، بـەڵام لـە بابـەتی نازناوەكـەی جیاوازتر لـە هـەموو سەرچـاوەكانیتری ئیـسلامی بـە (تـەبریزی گـۆرانی)

---

[1]البقاعي ( ت ٨٨٥ هـ ): عنوان الزمان بتراجم الشيوخ والأقران ،حققه الدكتور حسن حبشي مع الباحثـة إزيس زكا قرياقص ، و صدر الجزء الأول منه عن دار الكتب و الوثائق القومية بالقاهرة سنة : ٢٠٠١ــ ، ص ٦٠.

[2]المولى تقي الدين بن عبد القادر التميمي الدّاريّ الغزّيّ المصريّ الحنفيّ المتوفي سـنة ١٠٠٥ هــ (١٠١٠ هــ ، الطبقات السنية في تراجم الحنفية ، الجـزء الرابـع ، المحقـق: د. عبـد الفتـاح محمـد الحلـو ، دارالرفـاعي ، القاهرة ١٩٧٠ ، ص ٣٢٢.

[3]شمس الدين أبو الخير محمد بن عبد الـرحمن بـن محمـد بـن أبـي بكـر بـن عثمـان بـن محمـد الـسخاوي (المتوفى: ٩٠٢هـ) : الضوء اللامع لأهل القرن التاسع ، منشورات دار مكتبة الحياة — بيروت ، الجـزء الاول ، ص ٢٤١.

هێنـاوە.[1] لەگـەڵ ئەوەشـدا سەرچـاوەکانی تـر، لـە پـێش و پـاش خـستنی نازناوەکەی گۆرانی هاو بۆچوون نین، بۆ نموونە عادل نویهز ناوی گـۆرانی ئـاوا نوسـیوە (شـارەزوری همـەدانی تـەبرێزی گـۆرانی، (اللکنـوی أبـو الحسنات) ناوی گۆرانی بە ئیسماعیل بردووە، نازناویشی بـە شەمـسەدین گۆرانی هێناوە.[2]

هەرچی پەیوەندی بە سەرچاوە تورکییەکانەوە هەیە، ئـەوە ئـەوانیش ڕاستەوخۆ لە سەرچاوەکانی عەرەبی وەریانگرتووە، بەڵام لای نووسـەرە تورکەکان تەنها نازناوی گۆرانی بەس بووە، بۆ ئەوەی ئەم زانا کوردەی پـێ بناسـرێتەوە، باشـترین سەرچـاوە بـۆ ناسـینی گـۆرانی پـەرتووکی مێژوونووسی بـە ناوبـانگ (تاشـکۆپری زادە )یـە، کـە سـەردەمی ژیـانی نزیکە لـە گـۆرانی، بـە ئەحمـەد ئیـسماعیل گـۆرانی هێنـاوە [3]. لـە لیـستی کتیبخانەکانی دەوڵەتی عوسمانییش تەنها بە ئەحمەدی کوڕی ئیسماعیلی گۆرانی هاتووە.[4] موستەکەیم زادەش ناوی مەلا گۆرانی بـە وەسـفێکی زۆر تێکەڵ و عیرفانی داڕشتووە، بەم شێوەیە (المـولي الفاضـل الكامـل مـلا كـوراني احمـد شمـس الـدين افنـدى ابـن اسماعيـل الكـوران )، هەرچـی

---

[1] محمد بن علي الشوكاني : البدر الطالع بمحاسن من بعد القرن السابع ، دار الكتاب الإسلامي (تصوير) ، جزء الاول ، ص ٣٩.

[2] عادل نويهض : معجم المفسرين «من صدر الإسلام وحتى العصر الحاضر» قدم لـه: مُفـتي الجمهوريـة اللبنانية الشَّيْخ حسن خالد ، : مؤسـسة نـويهض الثقافيـة للتـأليف والترجمـة والنـشر، بـيروت – لبنـان ، الطبعة: الثالثة، ١٤٠٩ هـ – ١٩٨٨ م ، ص ٣٠.

[15] أحمد بن مصطفى بن خليل، أبو الخير، عصام الدين طاشْكُبْري زَادَهْ (المتـوفى: ٩٦٨هـ ) : الـشقائق النعمانية في علماء الدولة العثمانية ، دار الكتاب العربي – بيروت ، ص ٥١.

[4] نور عثمانه كتبخانه سنده محفوظ كتب موجوده نك دفترى در (استانبول) تركيه–استانبول ، ص ٢٦.

ئینسكلۆپیدیای ئیسلامییە، كە بە زمانی توركی نووسراوە، تیایدا هاتووە:مەلا گۆرانی ناوی خۆی شەمسەدینی كوڕی ئەحمەدی كوڕی ئیسماعیلە، لە هەندێ سەرچاوەش بە شەمسەدین یا شەرەفەدین یاخود شەهابەدین ناوی دەركردووە. سەرەتا بە شەڕەفەدین، دواتر بە پاشكۆی شەهابەدین كۆتایی هاتووە [1].

ساكب یەڵدز، كە تێزی دكتۆراكەی لە بارەی مەلا گۆرانییەوەیە (مەلا گۆرانی و تەفسیرەكەی) هاوكات سەرچاوەیەكی گەورەی توێژینەوەكەشمانە دوای كۆكردنەوەی بۆ چوونی چەندین نووسەر بەم جۆرە ئاماژە بە ناو و نازناوی دەكات (ئەحمەدی كوڕی ئیسماعیلی كوڕی عوسمانی، شەهابەدینی گۆرانی)یە. [2]

روهان ئالاكۆمیش بە پشتبەستن و كۆكردنەوەی سەرچاوە توركییەكان تەنها ئاماژەی بە نازناوی مەلا گۆرانی كردووە، و دەڵێت:گۆرانی بە شەهابەدین ئەحمەد جار نا جاریش بە ئەحمەد گۆرانی ناسراوە. [3]

---

[1] Ahmed Ateş, Molla Gürani, İslam Ansiklopedisi,Ahmet Ates, Molla Gorani, Islam Ansiklopedisi, cilt 8 Istanbul, dorduncu baski, 1987 ،s 248-249.

[2] Doç. Dr. Sakıp Yıldız ; Fatih'in Hocası Molla Gürani ve Tefsiri , 1. Baskı , 1988 , s18.

[3] كوردەكانی ئەستەنبۆلی كۆن ( ١٤٥٣–١٩٢٥) وەرگێرانی ئەحمەد تاقانە ، كوردستان، هەولێر، ٢٠٠٥ ، ل ٢٥.

لە پەرتووکی شیکردنەوەی فەرموودەی بوخاری، کە دانـراوی گـۆرانیی خۆیـەتی، لـە دوای نـاوی بـاوکی ئیـسماعیل عوسمـان کـوڕی محەمـەد هاتووە.

سەرچاوە کوردییەکانیش بۆچوونی جیاواز و تایبەت بـە خۆیـان هەیـە، مامۆستا عەبدولکریم مـودەڕیس نـاوی مـەلا گـۆرانی بـە ئەحمـەدی کـوڕی ئیـسماعیل گـۆرانی هێنـاوە [1].مـەردۆخی لـە پـەرتووکی (مـشاهر کـرد) بۆچوونێکی تەواو جیاوازی هەیە، باوکی عەباسی کردۆتە نازنـاوی گـۆرانی بـەم شـیوەیە شـەهابەدین ئـەبو عـەباس ئەحمـەدکوڕی ئیـسماعیل کـوڕی عوسمان شارەزووری گۆرانی هاتووە [2]. هەرچـی ئـەمین زەکیـشە، ئـەوا نـاوی گـۆرانی بـە مـەلا ئەحمـەد گـۆرانی و نازناوەکەشـی بـە تێکـەڵی هێنـاوە، بـە شـەهابەدین گـۆرانی، هـەروەها دەڵێـت نـاوی باوکیـشی ئیسماعیلە.[3]

ئەو هەموو بۆچوونە جیاوازانە، نەیتوانی دڵمان ئـاو بـدات بۆیـە نـاوی خوامـان لێهێنـا، و بەڕێکـەوتین بـۆ مەرکـەزی ئەرشـیفی عوسمـانی لـە ئەستەنبوڵ، بە هیوای ئەوەی ڕاستەوخۆ بتوانین چەند دەستنووسـێکی مەلا گۆرانی خـۆی یـان بەلایـەنی کـەم، چـەند بەڵگەنامەیـەکی نزیـك لـەو سەردەمە بدۆزینەوە، بـۆ ئـەوەی خۆمـان وخوێنـەر لـەو هـەموو بۆچـوونە جیـاوازە ڕزگـار بکـەین، ماندووبوونەکـەمان بـێ سـوود نـەبوو چـەندین بەڵگەنامەی گرنگمان دەستکەوت، لە هەموویان گرنگتر ئەو فتوایانە بوون،

---

[1] العلامة الشيخ عبد الكريم المدرس : علمائنا في خدمة العلم والدين ، الطبعة الأولى ١٤٠٣ هـ = ١٩٨٣ ، ص ٦٨.

[2] تاريخ مشاهير كرد (عُرفا، علما، اُدبا، شعرا) جلد اول / بابا مردوخ روحاني شيوا / ١٣٨٢ طهران ، ص ١٣٥.

[3] محمد امين زكي ، تاريخ سليمانية ، بغداد ، ١٩٥١ ، ص ٢٣٤–٢٣٥.

كه بـەرێز (موفيـد يوكسيل)يـش  بـڵاوی كردوونەتـەوە،[1] بريتـی بـوون لـە كۆمـەڵێك فتـوا،  كـە مـەلا گـۆرانی خـۆی بـە دەسـت و خـەتی خـۆی نووسيبوونی، لە ژێرەوەی  فتواكانی  لە پاڵ ئيمزا ئاڵۆزەكەی و ناسـاندنی خۆی بە هەژاری بەر  دەرگای خوا تەنها ناوی خۆی بە ئەحمەد نووسيوە.

دوای گواستنەوەی گرنگترين  سەرچاوەكانی عەرەبی، توركی،كـوردی، دەربارەی مەلا گۆرانی چەند خاڵێكی هاوبەش و وێكچوو لە نێوانيان هەن، بۆ نمونە هەموو سەرچاوەكان كۆكن لەسەر نازناوەكـەی كـە  (گـۆرانی)يـە. ناوی خۆشی ئەحمەدە  ناوی  باوكی ئيسماعيلە، ناوی باپيری  عوسمانـە، دوای ئەوە ئەحمەد و دواتر رەشيد دواتر  ئيبراهيم دێت.

كەواتە مەلا گۆرانی ناوی تەواوی (ئەحمەدی كوڕی  ئيـسماعيلی كـوڕی عوسمانی كوڕی ئەحمەدی  كوڕی رەشيدی كـوڕی ئيـبراهيم)ە. سـەبارەت بـە نازناوەكەشـی،  هـەموو سەرچـاوەكان لـە نازنـاوی گـۆرانی دڵنيامـان دەكەنەوە، دواتر نازناوی شەهابەدين، كـە زۆربـەی كـات وەكـو پێـشگرێك هاتووە، هاوكات لەگەڵ نازناوی شەرەفەدين  لە كۆتايی و هەندێ جـاريش شەهابەدين گۆرانی ياخود  شەمسەدين گۆرانی بەيەكەوە هاتوون. هەرچی پەيوەندی بە نازناوی شارەزووريش هەيە، ئەو مێژوونووسانەی  دوای مەلا گۆرانی هاتوون، ئەم نازناوەيان بۆ دانـاوە، ئەمـەش بـە مەبەسـتی تێكـەڵ نەكردنی مەلا گۆرانييـە لەگـەڵ مـەلا گۆرانييـەكانی ديكـەی كـە  نزيـك لـەو سەردەمە ژياون.

---

[1] http://mufidyuksel.com/?s=Molla Gurani





**سێ فتوای مەلا گۆرانی، کە تەنها  ئاماژەی بە ناوی خۆی کردووە**

(Mufid Yuksel) (ئەحمەد)

### ١. ٣:ڕەچەڵەك و شوێن و ساڵی لە دایکبوونی مەلا گۆرانی:

سەبارەت بە ڕەچەڵەکی کوردبوونی مەلا گۆرانی، ئەوە هیچ گومان و گفتوگۆیەك لەو بارەیەوە هەڵناگرێت، بەڵام ئەو کاتە گومان کەوتە سەر کورد بوونی مەلا گۆرانی، کە کۆتایی بە دەوڵەتی عوسمانیی لە ساڵی١٩٢٤ ز هات. میللەتان لەگەڵ کۆتای هاتنی خەلافەتی ئیسلامی و دامەزراندنی دەوڵەتەکانی جیهانی ئیسلامی لەسەر بنەمای نەتەوەیی. هەر میللەتەو کەوتە کۆکردنەوەی سەروەریی مێژوویی خۆی. دەوڵەتی عوسمانیی نەك هەر میراتی خاك و سامانەکەی دابەشکرا، بەڵکوو میراتی مێژوویی و کلتووریشی بەسەر میللەتاندا دابەشکرا ! یان ڕاستر بڵێین هەر نەتەوەیەك کەوتە پچڕان و لێکردنەوەی سەروەرییە گەورەکان لە جەستەی ماندوو شەکەوت و خوێناویی دەوڵەتی عوسمانی و ئەم سەروەریانەشیان بە بۆن و رەنگی نەتەوەیی بۆیەکران، وەلێ پێشتر،. تا سەرەتایی سەدەی بیستەم، شتێك نەبوو بەناوی دەمارگیری نەتەوە باشترین بەڵگەش بۆ ئەم قسەیە وتەکەی ئەمین زەکییە، کە ئاماژە بەوە دەکات کە تا بیرۆکەی نەتەوەیی و رەگەزپەرستی لای تورکەکان نەوروژێنرا، هەستی بەوە نەکرد بوو کە کوردە ![1] ڕابەرایەتی فیکری تۆرانی بە سەرپەرشتی (نامیق کەمال) و (زیا گۆلب ئالب) بووە بنەمای

---

[1] خلاصة تاريخ الكرد وكردستان من اقدم العصور التاريخية ، دار الشؤون الثقافية العامة العراقية ، بغداد ، ٢٠٠٥ ،ص ٤٨ .

پەروەردەی موستەفا کەمال، کە بریتی بوو لە تیۆری باشترین ڕەگەز تورکە و دروشمی (چەندە دڵ خۆشم، کە تورکم) !.

مەلا گۆرانیش بووە قوربانیی ئەم ملمەلانێیە تۆرانییەی ڕەگە پەرستی تورکەکان، شایەنی باسە بەشێك لە ڕەگەزپەرستەکانی تورك بە ئەنقەست ڕەگەزی مەلا گۆرانییان کرد بە تورك، مخابن ئەم پەتایی چەواشەکارییە سنورێکی فراوانی تێپەڕاندو و چینی پیاوانی دینی و رۆشنبیرە مونسیفەکانی تورکیاشی گرتەوە. موستەفا کەمال هەرچەندە توانی بەهێزی بازووی گورزێکی کەمەرشکێن لە سەرچاوەکانی تورکی بدات و دەستکارییان بکات، بە بەرژەوەندی بیری تۆرانی بیگۆڕێت،بەڵام لە بەختی ئێمە پەرتووکی زانایانی هاوسەردەمی مەلا گۆرانیمان بۆ بەجێماوە، کە هەموویان بە زمانی عەرەبی نووسراون، جگە لە وڵاتی تۆرانییەکان لە شوێنی تریش پارێزراون، کە بۆچوونی کۆنکرێتی لە بارەی کورد بوونی مەلا گۆرانی دەدەن.

پێش ئەوەی قسە لە بارەی ساغکردنەوەی رەچەڵەکی گۆرانی بکەین، باشترە باس لە فێڵ و تەڵەکی لەو جۆرە بکەین، کە پەیوەندارە بە مەسەلەی کورد و کۆماری نویی تورکیا، ئەویش بریتییە لە بابەتی بەسەرهاتی کتێبێکی سەختە لە بارەی رەچەڵەك و مێژووی کورد، بەکر شوانی کاری جدی لەو بارەوە کردووە، شیکردنەوەی باشیشی بۆ ئەم بابەتە ئەنجامداوە،هەرچەندە توێژەر لە بارەی ناونیشانی باتەکە (بەسەرهاتی کتێبێکی ساختەی عوسمانی دەربارەی کورد) باشتر بوو لە شوێنی ووشەی (عوسمانی)، (کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی) بەکاربێ

نابوایـه، بـەڵام لەگـەڵ ئەوشـدا لامـان گرنگبـوو بابەتەکـە وەکـو خـۆی داگرین،کە بەم جۆرە دەستپێدەکات:

لە ساڵانی کۆتـایی دەوڵـەتی عوسمانیـدا کۆمەڵـەی ئیتیحـاد و تـەرەقی (اتحاد و ترقی جمعیەسی) ئاوی بۆ ڕشتبوو. سەرانی ئەو کۆمەڵەیـە سـاڵی ۱۹۱۳ بەتەواوی دەسـتیان بەسـەر دەسـەڵاتدا گـرت و کەسـانی بـەهێزی ناویان کە بە سێکووچکەی ئەنوەر و تەلعەت و جەمال پاشا ناسرابوون، تا ئەوپـەڕی سـنوور تورکـچی و تـورانی بـوون. ئەمانـە لەگـەڵ هەڵگیرسـانی شەڕی جیهانیی یەکەمدا دەسەڵاتی دەوڵـەتیان گرتـە دەسـت و لەبـەرەوە دەست بەکار بـوون بـۆ پراکتیزەکردنـی بیرۆکـەی دەوڵـەتی یـەك نەتـەوە. حکوومـــەتی کۆمەڵـــەی ئیتیحـــاد و تـــەرەقی لـــە ســـاڵی ۱۹۱٦دا بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی عەشـایەرەکان و کۆچـبەران (عـشائر و مهـاجرون مدیریت عمومیەسی)ی دامەزراند. ئەرکی ئـەو دامەزراوەیـە بـریتی بـوو لـە ئەنجامدانی توێژینەوە و داڕشتنی سیاسەت و بەرنامەی کاریگەر و گونجاو بۆ ئاسیملەکردن و تواندنەوەی کـورد و عەلـەوی و هـەموو گـەل و گرووپـە ناتورکـەکانی ژێـر دەسـەڵاتی دەوڵـەتی عوسمـانی. نۆبـەرەی کـاری ئـەو بەڕێوەبەرایەتییـە بـریتی بـوو لـە سـازکردنی زەمینـەی گونجـاو بـۆ پـەیڕەوکردنی سیاسـەتی ئاسیملاسـیۆن ئـەویش لـە ڕێـی ئەنجامـدانی توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی کتێبەوە. ئەو بەڕێوەبەرایەتییـە پـاش ئـەوەی کتێبێکـی لەسـەر عەلەوییـەکان بـڵاو کـردەوە، ئـەمجار کتێبێکـی زۆر سەمەرەی لەبارەی کوردەوە بە ناونیشانی (کوردەکان — توێژینەوەیـەکی مێـژوویی و کۆمەڵایـەتی) و بـە زمـانی تـورکیی عوسمـانی چـاپ و بـڵاو

کردەوە. ناوی کتێبەکە بە تورکی:(کردلەر–تاریخی واجتماعی تدقیقات).
بەپێی زانیارییەکانی سەر بەرگی یەکەم، کتێبەکە لە (ئەکادیمیای ڕۆژهەڵاتناسیی بەرلین) دەرچووە و نووسەرەکەیشی کەسێکی ئەڵمانە بەناوی دکتۆر فریچ. لە یەکەم نیگادا هیچ کێشەیەك بەدی ناکرێت و تەنانەت ڕۆشنبیرانی کوردی ئەو سەردەمە زۆریان بەلاوە گرنگ بووە کە دەوڵەت کتێب دەربارەی کورد بڵاو دەکاتەوە. بۆ نموونە" لە ژمارە ١٣٠ ی ڕۆژنامەی (اجتهاد)دا کە لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٨ دەرچووە، وتارێکی کامەران عەلی بەدرخان سەبارەت بەو کتێبە بەرچاو دەکەوێت. بەڵام کاتێك مرۆڤ دەست بە خوێندنەوەی ئەو کتێبە ٣٨٨ لاپەڕەییە دەکات، هیچ هۆکار و هاندەرێکی تێدا بەدی ناکات بۆ دڵ پێخۆشبوون، چونکە ئەو کتێبە بە زمانێکی زۆر ناسك هەندێك تێز دەخاتەڕوو و تیایاندا نکۆڵی لە هەبوونی میللەتێك بەناوی کورد دەکات و پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە ئەم میللەتە هیچ ڕۆڵێکی لە مێژوودا نەبووە و تەنانەت زمانێکی سەربەخۆ و تایبەت بە خۆیشی نەبووە و نییە. بەوجۆرە کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی بە بڵاوکردنەوەی ئەو کتێبە هەوڵی داوە زەمینەی سیاسی بۆ ئاسیملەکردنی کورد خۆش بکات.

وەك ئەوەی زانای کۆمەڵناس پرۆفیسۆر د. ئیسماعیل بێشکچی و توێژەر عالیشان ئاکپنار لە دوو لێکۆڵینەوەدا ئاماژەیان بۆ کردووە، لە ڕاستیدا کەسێك بەناوی دکتۆر فریچ بوونی نییە و کتێبەکە لەلایەن کارمەندێکی ئاسایشەوە بەناوی هابیل ئادەم کە ناوی ڕاستەقینەی (ناجی ئیسماعیل پەلیستەر)ە، نووسراوە. بەڵام بۆ ئەوەی کتێبەکە بەهەند

وەربگیرێـت و ڕای گـشتی گومـان لـە ناوەڕۆکەکـەی نـەکات، نووسـەر لـە هەنگاوێکی ساختەکارانەدا ناوی خەیاڵیی دکتۆر فریچی خستووەتە سەری و وەك یەکێك لە توێژینەوە و بەرهەمەکانی ناوەنـدێکی خـاوەن ئیعتیبـاری (ئەکادیمیای ڕۆژهەڵاتناسیی بـەلین) خـستوویەتیە بەردەسـتی خوێنـەران. ئاکپنار لە ئەڵمانیا و چەند وڵاتێکی ئەوروپا گەڕاوە و سۆراخی ناوی دکتۆر فریـچی کـردووە. بـەڵام هـیچ نووسـەر و ڕۆژهەڵاتناسـێکی بـەو نـاوەوە نەدۆزیوەتەوە. ئێستا بەتەواوی دەزانرێت کە نووسەری کتێبی (کوردەکان — توێژینەوەیـەکی مێـژوویی و کۆمەڵایـەتی) سـاختەکار نـاجی ئیـسماعیل پەلیستەری بەڕەچەڵەك ئەلبانی و کارمەندی ئاسایـشی ئـەو سـەردەمەیە. ئەوەی تا ئێستا ڕوون بووەتەوە، پەلیستەر کۆمەڵێك کتـێبی نووسـیووە و لە هەر کتێبێکێشدا ناوێکی جیاوازی بـەکار هێنـاوە، لەوانـە:هابیـل ئـادەم (وەك وەرگێڕ)، دکتۆر فریچ، فرایلیچ، پرۆفیسۆر جـۆنس مـۆل، پرۆفیـسۆر ڤایت، پرۆفیسۆر لیباهـ (ئەگەر سەرنج بدەن، ئەمەیان هـەر هابیلـە، بـەڵام بە خوێندنەوەی لە چەپەوە بۆ ڕاست)، تەبرێزی ناجی ئیسماعیل و چـەند ناوێکی تر.

سەبارەت بە ناوەڕۆکی کتێبی (کوردەکان — توێژینەوەیـەکی مێـژوویی و کۆمەڵایەتی)

کتێبەکـە سـاڵی ١٩١٨ وەك سـێیەمین بڵاوکـراوەی بەڕێوەبەرایـەتیی گـشتیی عەشـایەرەکان و کۆچـبەران چـاپ و بـڵاو کراوەتـەوە. لـە دوای پێـشەکی، چـەندین سەرباسـی وەك:"عەشـیرەتەکانی کـورد، کوردەکـانی ئێران، کوردەکانی ناو سنوورەکانی ئەمڕۆی تورکیا، کوردەکانی ویلایـەتی

موسڵ، بەگ–میرەکانی مەروان، بەگزادەکانی فازوولییە، بەگزادەکانی لورستانی بچووك، میرەکانی حەسەنکێف، میرەکانی بابان، فەرمانڕەوایانی بتلیس و هتد.. لەخۆ دەگێت. ئەوەی مایەی سەرنجە، تەنیا خوێندنەوەی پێشەکی بەسە بۆ ئەوەی خوێنەر لە مەبەست و نیازی نووسەر حاڵی ببێت. وەك لەسەرەوە ئاماژەم پێ دا، نووسەر بە زمانێکی فرە ناسك هەوڵ دەدات لە خوێنەر بگەیەنێت کە میللەتێك بەناوی کورد نییە و ڕەچەڵەکی کورد دەباتەوە سەر تورك. بەڵام ڕاستەوخۆ ناڵێت کوردەکان تورکن، چونکە لە سەردەمی بڵاوکردنەوەی ئەو کتێبەدا هێشتا کارێکی هێندە ئاسان نەبووە تێزێکی لەو جۆرە ببڕێتە مێشکی خەڵکەوە.

پێویستە ئەوەمان لەبیر نەچێت کە لەو سەردەمەدا کۆمەڵێك ڕۆشنبیری کورد لە ڕۆژنامەکانی ئیستانبوڵدا دەیاننووسی، یان خۆیان ڕۆژنامەی کوردی–تورکییان دەردەهێنا. ئەو کوردانە کە بە ناسنامەی کوردبوونی خۆیانەوە ناسرابوون، هەندێکیان لە ڕیزەکانی کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقیدا بوون و بگرە تیایاندا هەبوو لە دامەزرێنەرانی ئەو کۆمەڵەیە بوو. بۆیە هێشتا مەحاڵ بوو بتوانرێت بێ پەردە و بەئاشکرا نکۆڵی لە هەبوونی کورد بکرێت. بۆ زیاتر تێگەیشتن لەو دۆخە دەکرێت ئەم نموونەیە بخەینەڕوو: "کۆمەڵەی تورك" کە دوای مەشرووتەی دووەم هاتە دامەزراندن، سەرەتا بارەگای نەبوو، بۆیە کۆبوونەوەکانی خۆی لە شوێنانی وەك "دار الفنون"، بارەگای ڕۆژنامەی "یەنی گازەتە" و "یانەی کوردی" ئەنجام دەدا کە هەموویان لە بەیئۆغلۆی ئیستانبوڵ بوون. واتا کەسانی هەڵگری بیری تورکایەتی لەو سەردەمەدا وەك هەر ناسنامەیەکی

تر بۆ ناسنامەی کوردیان دەڕوانی. ئەمەیش هابیل ئادەمی ناچـار کـردووە زۆر "وەستایانە" ڕەچەڵەکی کورد بباتەوە سەر تورك.

نووسەر سەرەتا هەندێك لە تێزە باوەکـانی سـەبارەت بـە کـورد بـەدرۆ دەخاتەوە و "دەیسەلمێنێت" کە کوردەکان بەڕەچەڵەك عـەرەب و گـوورج و کافکاسیایی نین و پێی وایە: "کوردەکان لەبەر ئەوەی مێژوویان نـەبووە، کولتـووری میللـی و ئـەدەبیاتی نووسـراویان نییـە. ئـەوان تـەنیا خـاوەنی شـەرەفنامەن (شـەرەفخانی بتلیـسی) کـە ئـەویش تاقانـە مێژوونووسـی کوردەکانـە." نووسـەر لـە باسـی زمـانی کوردیـدا دەنووسـێت: "ئـەم زمانـە بەپێی ڕێزمان سەر بە کۆمەڵـەی زمانـەکانی هنـدو-ئەوروپاییيـە و لەسـەر بناغەی زمانی فارسییە و وا دێتە پێش چاو وەك ئەوەی لە نێوان فارسـیی ئـەمڕۆ و زمـانی ئێرانـی شـا عەباسـدا مابێتـەوە. بۆیـە بەتـەواوی زمـانی میللـەتێك نییـە، بـەڵکو دەکرێـت بـە زمـانێکی ژێـر کاریگـەریی جۆراوجـۆر دابنرێت. بەتایبـەتی شـایەنی باسـە کـە وشـە هاوبەشـەکانی نێـوان هـۆزە کوردەکان وشەگەلی کۆنی کوردی، پەهلەوی، زەند و فارسـیی کـۆن نـین، بگرە وشـەی تـورکی، تـورکی-عـەرەبی (وشـە عەرەبییـەکانی نـاو زمـانی تورکی)، فارسیی نوێ و فارسیی سەردەمی شـا عەباسـن." نووسـەر پـاش "سـەلماندن"ی ئـەوەی کـە کوردەکـان کۆمـەڵێك مرۆڤـی بـێ مێـژوو و بـێ کولتوور و بـێ زمـانن و بـۆ ئـەوە ناشـێن پێناسـەی میللـەت بیانگرێتـەوە، ئەمجار بەخشکەیی دێتە سەر خاڵی مەبەسـت و دەنووسـێت: (دەزانـین لـە سەردەمی ئاشوورییەکاندا لە کوردسـتانی ئـەم سـەردەمەدا حکوومـەتێکی تـورانی هـەبووە بـەناوی (لوردەهـو). ئـەمانیش وەك جـەنگیز وشـەی

(کورد)یان بەکارهێناوە و دەشێت پێشبینی بکرێت کە لەگەڵ گەیشتنی عەشیرەتە کوردەکاندا بەو سەردەمە، ئەو وشەیە چووبێتە زمانی ڕۆژانەیانەوە. وشەکە (کورد) ناسناوی میرەکانی لوردەهو بووە و پاش ئەوەی کوردەکان جێی سەرگەورەکانی خۆیان گرتووەتەوە، یان لەگەڵ یەکەم هاتنیاندا کاتێك ئەو خزمەتە گرنگەیان بینیووە، ناوی (کورد)یان لە خۆیان ناوە. ئەمە بەهێزترین بیردۆزەیە. بەمجۆرە دەکرێت پەیوەندی لە نێوان ناو و ناولێنراویشدا بدۆزرێتەوە. دکتۆر سییچ پێی وایە وشەی (کورد) لە وشەی (لوردەهو)ەوە هاتووە. ئەمەیش بۆچوونێکی گرنگە..."

لێرەوە نیازی نووسەر ڕوون دەبێتەوە و ئیدی هەموو شتێك زەلاڵ و ئاشکرایە. ئەو پێی وایە وشەی کورد لە وشەی لوردەهو داتاشراوە. لوردەهویش دەوڵەتێکی تورانی، واتە تورکی بووە و بەم پێیە کوردەکان بەڕەچەڵەك تورانی—تورکن!!!! ئەم بیردۆزەیە کە یەکەمجار ساڵی ١٩١٨ لەلایەن هابیل ئادەمەوە خراوەتەڕوو، سەرەتا هێندە بەهەند وەرنەگیراوە. بەڵام کۆماری تازە دامەزراو دوای ساڵی ١٩٢٥ "نرخ و بەها"ی کتێبەکەی ئادەمی بۆ دەردەکەوێت. دوای دامرکاندنەوەی شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران کە یەکەم گەورەترین ڕاپەڕینی گەلی کورد بوو، لە مێژووی تازە کۆماردا، دەست کرا بە پەیڕەوکردنی سیاسەتی بە تورککردن و کتێبەکەی ئادەم بوو بە "شاکار" بۆ ئەوانەی کە پێیان وابوو کوردەکان بەڕەچەڵەك تورکن و زمانی کوردیش تێکەڵەیەکە لە تورکی و عەرەبی و فارسی. ژەنەراڵ ناجی تناز ناوێك سساڵی ١٩٢٦ کتێبێکی بەناوی (مێژووی وان — توێژینەوە لەبارەی کوردەکانەوە) سەبارەت بە

کورد چاپ کردووە، و تیایدا بەئاشکرا نکۆڵی لە هـەبوونی کـورد دەکـات و ڕەچەڵەکی کوردەکان دەباتەوە سەر تورك. ئەوەی کـە لەمـەڕ کتێبەکـەی تناز لە هەمان کاتدا مایەی غەم و پێکەنینـە، ئەوەیـە کـە نزیکـەی هـەموو بۆچـوونەکانی خـۆی لەبـەر ڕۆشـنایی تێـزە هەڵبەسـتراوەکانی نـاو کتێبـە ساختەکەی ئادەم دارِشتووە.


نشریاتندن : ۳

کردلر

تاریخی واجتماعی تدقیقات

محرری : دوقتور فریج

برلین شرق آقادەمیسی طرفندن نشر ایدلمشدر .

طابع وناشری

کتبخانۀ سودی

استانبول — باب عالی جادەسی

۱۳۳٤

مطبعۀ اورخانیه

نوێترین ستەم  کە لە مەلا گۆرانی کراوە، بریتییە لەو فیلمی (فەتح ١٤٥٣) کە لە ساڵی ٢٠١٢ لە بارەی ژیانی محەمەد فاتیح و فەتحی ئەستنبۆل دەرهێنرا، لە راستیدا ئەم فیلمە بەیەکێ لە فیلمە هەرە بەهێزەکانی ساڵی ٢٠١٢ دەستنیشان کرا، داهاتی تەنها لە ٣ مانگی یەکەم (١٧) ملیۆن دۆلار بوو، لە دەیان وڵاتی ئەورووپی، ئەمریکی، ئاسیاوی و ئەفریقا نمایشکرا ماوەی  فیلمەکە (١٦٠) خولەکە، جگە لە ڕۆڵی محەمەد فاتیح، زۆرترین کەس لە پیاوانی سیاسی و سەربازی و ئاینی بە دیارکەوتوون، لە زاناکان وەکو (مەلا خەسرۆ) و (ئاق شمەسەدین)، بەڵام مخابن بەیەك چرکەش ڕۆڵی کەسایەتی مەلا گۆرانی لەو فیلمە دەرناکەوێت ! !

با زیاتر لەوە لە ناوەڕۆکی بابەتەکە دوور نەکەوینە و ئەم گازاندانەش بۆ کاتی و شوێنی خۆیی هەڵگرین، سەربارەت بە ڕەچەڵەکی مەلا گۆرانی ئەوە نازناوی گۆرانی  و مەزهەبی شافیعیەکەی یارمەتیدەرێکی گەلێك باشە تا لەوێوە هاوکارمان بێت،  بۆ ناساندنی ڕەچەڵەکی مەلا گۆرانی، زۆر گەڕانمان کرد بە مەبەستی ناسینی گۆران،  چ وەکو عەشیرەت  یاخود شوێن، دوای کۆکردنەوە و لێکدانەوەی سەرچاوەکان چەند سەرەداوێکی باشمان  دەستکەوت.

## ١. ٤:سەبارەت بە ڕیشەی هۆزی گۆران

بۆ ئەوەی بە تەواوی لە ڕەچەڵەکی مەلا گۆرانی بگەین، پێویستە سەرەتا لە بارەی هۆزی گۆرانەوە توێژینەوەیەکی کورت بکەین. وشەی گۆران یان جۆرە قان (الجوران)، هۆزێکی مەزن و دێرینی کوردە، لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە ناوچەی پاوە، دەرەتەنگ، کرمان شان، ماهیدەشت، بەرزاییەکانی حەلوان، خانەقین و دەڤەرە شاخاوییەکانی خوارووی شارەزوور، شان بە شانی چەند هۆزێکی کورد ژیانیان گوزەراندووە، بەشێك لە نەتەوەی کوردیان پێکهێناوە، ئەم هۆزە لە چەرخی ئیسلامدا ڕۆڵی سیاسی و سەربازیی و ژیاریی و ڕۆشنبیری خۆیان گێڕاوە، خاوەنی دەسەڵاتێکی سیاسی و خێڵەکی بوون، دەیان ناودار لە زانا، مامۆستا، فەقیّ، دانەر، سۆفی و پیاوی ئایینیان پێگەیاندووە.[١]

مامۆستا هەژاری موکریان لە بارەی ناو و ڕەچەڵەکی گۆران، چەند بۆچوونێك بەم شێوەیە دەگوازێتەوە:

هێندێك لە مێژوونووسان لایان وایە چەند هۆزێك، کە لە پێشوودا بە زمانی پەهلەویی کۆن قسەیان دەکرد، لە سۆنگەی کۆچ و بارەوە هاتوونەتە ناو کوردان و کوردی فێربوون و زمانەکەی پێشووی خۆیان وەلا ناوە، کوردەکان بە مزگێنییەوە گوتوویانە:"ئەوا گۆڕان" واتا لەسایەنشینی بەسەربەرن" ئاوایی و گوندیان ئاواکرد و لە کۆچەران جیابوونەوە و کۆچەرەکان گوتیان:"گۆڕان"" واتا وەکو خۆیان نەمان".

[1] زرار صدیق : هۆزی گۆران ڕۆڵی سیاسی و ڕۆشنبیری ،گۆڤاری ئەکادیمی ژ ، هەولێر ٢٠٠٦ ، ل ١٧٥

جەمیل ڕۆژبەیانی بەجۆرێکیتر بۆی چووە " ئەم فەرموویە:"زۆر وێ دەچێ ناوی گۆران لە وشەی گۆرەوە هاتبێ، کە گۆر لە زمانی کوردیدا، بە کەرە کێوی، بە مەیدان، بە دەشت، بە قەور ئەوترێ" ئەبێ ئەم هۆزە کوردانە لەناو دەشتایی دا ژیابن" یان لە کاتی مەیدانداری زۆر ئازابن" یان لە ڕاوا زۆریان کەرە کێوی دەگرت " خاکی کوردستانەکەشیان دەکردە گۆڕی دوژمنان".

بەڵام بە بڕوای هەژار:هیچ یەك لەو چەند بۆچوونانە نەگەیشتوونەتە ئامانج و نیشانەیان نەپێکاوە، ئەو لای وایە ئەم گۆرانیش وەکو کورماژ سەرەتای لە ئایین بەندە " وەك دەزانین بەشێك لە مێژوونووسانی موسوڵمان پەیڕەوانی زەردەشت بە ئاگرپەرست ناودەبەن و لە فارسیشدا گەبر ئێژن"، هەروەك کوردەکانی خۆشمان دەڵێن:گاور، کەوابێ گۆران، گاورانە" واتا ئاگرپەرستەکان.[1]

ئەم لێکدانەوەی هەژار بۆ ئێمە گەلێك بایەخدارە،بەڵام دەکرێت لەگەڵ ئەم بۆچوونەی هەژاریش، بۆچوونەکەی مەسعوودی ببێتە جێگای هەڵوستەکردن، کە ئاماژە بەوە دەکات هۆزی گۆران لە سەدەی چوارەمی کۆچی و لە هەندێ شوێنی ناوچە شاخاوییەکانی ڕۆژهەڵاتی مووسڵ و دەوروبەری ئاکرێ دەژیان و لە پەیڕەوکارانی ئایینی مەسیحی بوون.[2]

---

[1] مەستورەی کوردستان : مێژووی ئەردەلان ، ساغکردنەوەی هەژار موکریانی ، دەزگای ئاراس ۲۰۰۲ ، لا ۲۰-۲۱-۲۲.

[2] زرار صدیق : ل ۱۷۸.

لە ڕاستیدا گۆران وەك لە سەرچاوە عەرەبیەکانی سەردەمی عەباسیدا هاتووە، یەکێکە لە هۆزە کوردە ناسراو و بە ناوبەنگەکان و لقێك پێکدەهێنن، لە چوار لقە سەرەکییەکەی کورد.[1] ڕەنگە گواستنەوەی هەموو ئەو وردەکاریانە زیاتر پەلکێشمان بکات بۆ نێو کۆمەڵێك وردەکاری وردتر، بۆیە کاتی ئەوەمان نییە گفتوگۆمان چڕ بکەینەوە لەسەر ئەوەی ئاخۆ گۆران هۆزێکی کوردییە یان فارس، ئەمە بەتەواوی لای مێژوونووسەکان یەك لای بۆتەوە کە گۆران هۆزیگی کوردی ڕەسەنە، بەڵام دەمانەوێیت لە بنەچەی گۆران بگەین، بە دوای ئەو پرسیارەدا بگەڕێین ئایا گۆران تەعبیرە لە هۆزێك یان شوێنێکی جوگرافی؟

ئەگەر کەمێك قووڵتر لەوەی هەژاریش بەدوای بنەچەی گۆراندا بگەڕێین، توێژینەوەکی چڕ و پوختی ڕۆژهەڵاتناسی ڕووسی (مینۆرسکی) دەربارەی گۆران بەر دەستە، کە نزیکەی (٦٦) لاپەڕەی بۆ تەرخانکردووە. (مینۆرسکی) وەك لە شەرەفخانی بەدلیسی دەگوازێتەوە کە کورد بەگشتی لە چوار لقی سەرەکی (کرمانج، لوڕ، کەلهور، گۆران) پێکهاتوون، سەربارەت بە ناوی گۆران پێی وایە کە ئەصلی ووشەی گۆران (گووران )ە، ئەمە دوای ئەوەی چەند لێکدانەوەیەکی زمانەوانی بۆ وشەکە کردووە.[2]

جوگرافیناسی جیهانی (ستربۆن)، لە سەرەتاکانی زایینی ژیاوە لە مەوسووعە گرنگەکەیدا مێژووی جوگرافی هۆزی گۆرانی بە هاوسێی

---

[1] زرار صدیق : ل ١٧٦.

[2] ڤلادیمێر مینۆرسکی : مینۆرسکی کورد ، وەرگێرانی ئەنوەر سوڵتانی ، دەزگای موکریان چاپی دووەم ٢٠٠٦ ، لا ١٤٨-١٤٩.

میدیەکان وەسکردووە، مێژوونووسەکانی چاخی ئیسلام ئەم ناوەیان بە زەحمەت بۆ هەزم کراوە، چونکەلەبەر نەبوونی پیتی "گ" لە عەرەبی ناچار پتی "ج " یا "ك" یان بەکارهێناوە. هەندێ جاریش گۆران بە جەورەقان یاخود جابارەق هاتووە، قەزوینی لە (نزهة القلوب) ئەم ناوەی بە شوێنێك بەستۆتەوە بە ناوی (گیلی گێلان) هێناوە.[1]

مینۆرسکی لای وایە (الجارقە) و (الجورقان ) یەك هۆزن،کەچی مەسعوودی بە دوو هۆزی لێکجیا دایناون، بەڵام مینۆرسکی وەك باسمان کرد، تەنانەت دەیەوێت ئەوەمان پێ بڵێت، کە گۆران هۆزێکی کورد نییە، بەڵکوو لقێکن لە میللەتانی ئێرانی و لە باشوری دەریای خەزەرەوە هاتوون و لە ناوچە کوردنشینەکان نیشتەجێبوون.

یەکێکیتر لەو ڕۆژهەڵاتناسانەی توێژینەوەی دەربارەی هۆزی گۆران کردووە، بریتیە لە Wiliam Eagleton ئینگلز لە کتێبێکی سەربەخۆ باسی هۆزەکانی کوردی کردووە، دەڵێت گۆران بریتییە لە هۆزیکی گەورە، کەوتوونەتە سەر ڕێگای سەرەکی کرمانشان تا سنووری عیڕاق، ئەم هۆزە لە نێوخۆدا دابەشی سەر پێنچ لقی سەرەکی دەبن ئیسبیری Qalkhani Esperi، قالخانی بهرامی Qalkhani Bahrami، توفانجی Tufanchi، یاسیمی Yasemi، حایدەری Haiddari. سەبارەت بە زمانی ئەم هۆزەش بە زمانی کرمانشانی دەیبەستێتەوە، بەڵام دەڵێت گۆران زاری تایبەت بە خۆی هەیە. لە رووی ئاینیشەوە

[1] ڤلادیمێر مینۆرسکی : ل ١٦٣.

ئەوان مەزهەبی ئەهلی حەقن، کە لقێکە لە مەزهەبی شیعە، دامەزرێنەری ئەم مەزهەبەش ئیسحاق بوو لە سەدەی ١٦ ی زاینی. [١]

هۆزی گۆران بە درێژایی نیوەی یەکەمی سەدەی پێنجەمی کۆچی، هێزێکی خێڵەکی ناوخۆی دەستڕویشتووی پێکدەهێنا، بۆیە کاتێك سوڵتان تۆغول بەگی سەلجوکی ( (٤٢٩-٤٥٥ ك ١٠٣٨-١٠٦٣ ز لە ساڵی ٤٣٧ ك، ئیبراهیم یەنالی بە سوپایەکەوە رەوانەی هەرێمی چیای کرد و داگیری کرد، توانی هۆزی گۆران ملکەچ بکات.

شاڵاوی توندوتیژ و یەك لە دوای یەکی سەلجوقییەکان بۆ سەر زێدی گۆران، کارێکی خراپی کردە سەر میرنیشین و هۆزە کوردە خانەدانەکان بە گۆرانەوە، بووە ئەگەری لەناوچوون و فەوتانی زۆربەی میرنیشینەکانی کورد، بەڵام بە بێ هێز بوونی سەلجوقییەکان گۆرانییەکان دووبارە توانیان لەسەر پێیەکانی خۆیان بوەستنەوە و دەسەڵاتی خۆیان بەهێز بکەنەوە[2]

فەیزوللا شەهاب الدین العمری خاوەنی کتێبی (مسالك الابصار فی ممالك الامصار ) کە نزیکە لەو سەردەمە ٧٤٩ ك، کاتێك باس لە خەڵکی شارەزوور دەکات، زۆر بەسەرسامییەوە ناوبانگی دانیشتوانی ئەم ناوچانەی بیستووە، دەڵێت کوردەکانی شارەزوور پیاوی زۆر ئازا و چاونەترسنو لە بەرانبەر دوژمن توندن، دەسەڵاتێکی فراوانیان هەیە لە نێوان وڵاتی عەرەب و عەجەم، لە نێوان چیاکانی هەمەدان و شارەزووردا

---

[1] القبائل الكردية ، ترجمة احمد محمود الخليل ، ص ٧٥.

[2] زرار صديق : لا ١٨٣-١٨٤.

هەیە، ئەمانە گۆرانیان پێ دەڵێن، هۆزێکی یەکگرتوون و هیچ جیاوازیان لە نێواندا نییە.[1]

بەڵام ڕووداوە چڕ و بەردەوامەکانی مێژوو، بە تایبەت ئەو شەڕە درێژخایەنەی نێوان عوسمانی سەفەوی و دواتر عوسمانیی و قاجاریی و ئەفشاریی، کاریگەری خراپی کردۆتە سەر پەرتبوون و بڵاوبوونەوەی ئەم هۆزە، بە تایبەت هەر لە پەیمانی ئەماسییە١٥٥٥ و پەیمانی زەهاو ١٦٣٩ و ئەرز رۆمی یەکەم و دووەم ١٨٤٧، کە گۆرانییەکانی بەسەر ئاسیا و ئەفەریقا دابەشکرد، هەندێ لە کۆچی ئەو هۆزانە بۆ پێش جەنگی عوسمانی سەفەوی دەگەڕێتەوە، سێ نووسەری عەرەب بە ڕەچەك میسری پەرتووکێکی سەربەخۆیان بە زمانی عەرەبی چاپ کردووە لە ژێر ناوی (کورد لە میسر بە درێژایی سەدەکان)، کە باسی چەندین کۆچی کوردانیان لە مێژوودا بۆ میسر کردووە، بە تایبەت لەسەردەمی سەلاحەدینی ئەیوبی لە هەندێ شوێن ئاماژەیان بە سەربازە شارەزوورییەکان کردووە لە ریزی سوپای زەنگییەکان لە سەرەتا و دواتر ئەیوبییەکان، کە بەشداریی هەڵمەت لە دژی خاچپەرستەکان و ڕووخانی دەوڵەتی فاتیمیان لە میسر کردووە،[2] تەنانەت هەندێ کەس لە هۆزی گۆرانییەکان پلەی باڵایان لە سەردەمی مەملیکەکان هەبووە، وەکو عەلائەدین گۆرانی، کە پلەی والی قاهیرەی هەبووە، لە سالانی ١٣٤٨ ز

---

[1] ابن فضل الله شهاب الدين العمري : الكتاب: مسالك الأبصار في ممالك الأمصار ، دار الكتب العلمية ، ٢٠١٠ ، مجلد ٣ ، ١٩٧–١٩٨.

[2] دوریە عەونی ، مەحمود زاید ، موستەفا عەوەز : کورد لە میسر بە درێژای سەدەکان ، وەرگێرانی حسین موستەفا ، ، ٢٠١٣ ل ٥٧.

مەقریزی بە یەکێ لە والییە هەرە باشەکانی دادەنێت، دوای وەفاتی خۆی کوڕەکەی حوسامەدین ١٣٦٥ ز جێگای باوکی دەگرێتەوە و توانی لەماوەی فەرمانڕەوایی کردنی ئاسایشی قاهیرە رابگرێت [١]

ئێستا هۆزی گۆران لە هەر چوار پارچەی کوردستان نیشتەجێن، زۆرینەیان لە کورستانی رۆژهەلات نیشتەجێن، لەگەڵ ئەوەشدا لە هەریەکە لە باشووری لوبنان و میسر. [٢] و لە باشووری عێراقیش هەر ماون [٣]. سەرەڕای ئەوەش بەر لەم سەردەمەش دوو گەرۆکی موسلمان ئیبن خوردانیبە (٢٨٠ ك –٨٩٣ ز) ) و ئیبن فەقیە (٣٤٠ك –٩٥٢ز زۆربەی هەرێمە کوردنشینەکان گەڕاون، یەکەمیان ئاماژە بۆ هۆزێکی کورد دەکات بە ناوی (الجابارقە )، کە لە دەوروبەری حەلوان دەژیان، دووەمیشیان باسی هۆزێکی کورد بە هەمان ناو دەکات، کە دانیشتووی دەڤەرێکن سەر بە شاری هەمەدان[4] .

کەواتە گۆران بریتییە لە عەشیرەتێکی گەورەی کورد، لە سنووری هەر چوار پارچەی کوردستان و تەنانەت لە میسر و لوبنان و باشووری عێراقیش بڵاو بوونەتەوە.

---

[1] هەمان سەرچاو : ل ٨٤–٨٦ .

[2] شێخ عەلی گۆرانی نووسەرێکی ناوداری لوبنانی شیعە مەزهەبە ئێستا خاوەنی چەندین لێکۆڵینێەوەی و پەرتووکی ئاینیە ، لە سایتێك کە تایبەت بەخۆیەتی ، باسێکی دوور و درێژی لەسەر گۆرانی کردووە . مێژووی دابەشبوون و کۆچکردنی گۆرانیەکان لە نێوان لوبنان و میسر خۆستۆتە ڕوو . بۆ زانیاری زیاتر بروانە لینکی بابەتەکە ی نووسەر :

http://www.alameli.net/article/158

[3] زرار صديق : ل ١٧٧

## ڕای مێژوونووسان دەربارەی زێدی مەلا گۆرانی چییە؟

باشترە لە پەرتووکی ئەو نووسەرانە دەستپێبکەین کە هاوڕێی مەلا گۆرانی خۆی بوون، یاخود سەردەمەکەیان لە ئەم نزیک بووە. مەلا گۆرانی لە هیچ لەو دەستنووس و نامانەی ئێستا ماون، ئاماژە بە سالْ و و زێدی لەدایکبوونی خۆی نەکردووە، بۆیە ناچارین بۆ زانینی شوێن و سالْی لەدایکبوونی مەلا گۆرانی پەنا ببەینە بەر سەرچاوەکان، بیقاعی یەکێکە لەو زانایانەی لە سالْی ٨٠٩ ك لە شام لەدایکبووە و هاوڕێی مەلا گۆرانی بووە لە حیجاز، ئاماژە بەوە دەکات وەکو هوالْم پێگەیشتووە مەلا گۆرانی، گوندی جەلەولا لەدایکبووە[1]، ئەم گێڕانەوەی بیقاعی مایەی هەلْوەستە لەسەرکردنە، ئایا جەلەولا هەمان ئەو جەلەولای ئێستایە؟ یاقوت حمەوی (٦٢٦)ك هاوسەردەمە وەسفی شارەکە بەم شێوەیە دەکات:جەلەولا کەوتۆتە سەر ڕێگای خوراسان، حەوت فەرسەخ لە خانەقین دوورە، رووبارێکی گەورە بەلایدا تێپەڕ دەبێت. هەمان ئەو شوێنە کە موسولمانەکان و ساسانییەکان لە سالْی (١٦) ی کۆچی تیایدا ڕووبەڕوو بوونەتەوە.[2] ئەم دلْنیابوونەوەی یاقوت حمەوی تەنها بۆ ئەوەبوو بزانین ئاخۆ مەبەستی بیقاعی جگە لەو شارەی ئەمرۆ پێی دەلْێن جەلەولا لەو کاتە شارێکیتر نەبووە بە ناوی جەلەولا. هەر چەندە ئەم زانیارییەی بیقاعی بەهانەی ئەوەمان دەداتێ کە لێرە وەلامێکی تەواو بدەینەوە،

---

[1] المصدر سابق ، ص ٦٠

[2] ياقوت بن عبد الله الحموي الرومي البغدادي شهاب الدين أبو عبد الله : معجم البلدان ، مجلد ٢ ، دار صادر ١٩٩٣ ، ص ١٥٦ .

سەبارەت بە زێدی مەلا گۆرانی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نابێت بۆچوونی مێژوونووسەکانی تر پشتگوێ بخەین.

مەقریزیش٨٤٥ك هەر هاوسەردەمی مەلا گۆانی بووە، ئەو ڕای وایە مەلای گۆرانی لە شارەزوور لەدایکبووە، هەر یەکە لە سەخاوی[1] ئەمین زەکی[2] و زیرکیلی[3] جەخت لە بۆچوونەکەی مەقریزی دەکەنەوە.

ئەم کۆدەنگییەی مێژوونووسان هەر لەخۆوە نییە، بەڵکوو بە بنەمایەکی زانستی و واقیعی بەستراوەتەوە، بۆیە هەڵساین بە گەڕان لە سەرچاوەکان، تا وەکو دڵنیابین لەوەی ئاخۆ شارەزوور بریتییە لە ناوچەیەکی فراوان لە کوردستانی ڕۆژهەلات؟ یاخود شارێکی تایبەت و سەربەخۆ بووە لەو سەردەمە؟، باشترین سەرچاوە کە دەستمان کەوت، بریتی بوو لە یاداشتنامەی گەڕیدەی موسوڵمانی بە ڕەگەز کوردی (ئەبولفیدا)، کە لە خانەوادەی بەرێزی بنەماڵەی ئەیوبی بوو، لە ساڵی ٦٧٢ کۆچی لە دیمەشق لە دایکبووە، دوای گەورە بوون و پێگەیشتنی لەژێر سایەی بنەماڵەی خواویستی ئەیوبییەکان، دەستدەکات بە نووسین و لێکۆڵینەوە لە بواری مێژوو و جوگرافیا و فیقه و هۆنراوە، ئەمە جگە لەوەی ئەبولفیدا جەنگاوەرێکی ئازا و چاونەترس بووە، دواجار لە ساڵی ٧١٠ك، دەکرێتە فەرمانڕەوای شاری حەما،، بەهۆی گەشتە بەردەوامەکانی ئەبولفیدا لە سنووری ئیمپراتۆری ئەیوبی، توانیبووی شارەزاییەکی زۆر

---

[1] المصدر سابق ، ص ١٧.

[2] المصدر سابق ، ص ٢٣٤.

[3] خير الدين الزركلي : الأعلام قاموس تراجم ، دار العلم للملايين ، ٢٠٠٢ ، ص ٩٧.

باش له بواری جوگرافی پەیدا بکات، ئەمەش وای کرد، بیرۆکەی نووسینی کتێبی (تقویمی البلدان)ی لا دروست ببێت،[1]

ئەبولفیدا له پەرتووکەکەی باس له شارێك دەکات به ناوی شارەزوور و دەڵێت (شارەزوور شارێکی بچووکه و دەکەوێته هەرێمی چیا و له هەمان کاتدا دەکەوێته نێوان مووسڵ و هەمەدان و شەش قۆناخ له حەلوان دووره (١٢٠) کیلۆمەتر[2]. هەریەکه له سەخاوی و شەوکانی شوێنی تەواوی زێدی مەلا گۆرانیان دیاری کردووه، که ئەویش دەڵێن له گوندی گۆران لەدایکبووه [3]. له نووسەره بیانییەکانیش،مێژوونووسی فەرەنسی (Franz Babinger) جەخت لەسەر بۆچوونەکانی سەخاوی و شەوکانی دەکات و دەڵێت مەلا گۆرانی له ناوچەیەکی کوردنشین له گوندێك سەربه شارەزوور به ناوی (گۆران) له دایکبووه[4].

لەڕاستیدا ئەو بۆچوونانەی سەرەوه هەموویان بای ئەوه دەکەن گومانیان تێدا هەڵگرین، چونکه ئەو زۆرینه مێژوونووسەی دەڵێن له شارەزوور لەدایکبووه، تەنها به ئیعتیباری ئەوەی ئەوکات هۆزی گۆرانی لەو ناوچه نیشتەجێ بووینه، بۆیه راستەوخۆ گەڕاندویێتیانەوه بۆ ناوچەی شارەزوور، بەڵام ئەگەر لەو ئەگەرانەی سەرەوه بەهێزترین ئەگەر هەڵبژێرین ئەوه شارەزووره، چونکه ئەلبوفیدا سەردەمەکەی زۆر نزیکه

---

[1] موحسین مامل : کوردستان له کتێبی تەقویم ئەبولدانی ئەلبولفیدای ئەیوبی ، خانەی موکریان ، هەولێر ٢٠١٤ ، لا ٣٣–٥٥–٨٣.

[2] موحسین مامل ، ل ١٣١.

[3] المصدر سابق ، ص ٣٩.

[4] Fatih Sultan Mehmed ve Zamanı , çeviren: Dost Körpe , Beşinci baskı: 2003 , İstanbul , s 40.

لەو کاتە و لە نێوان کۆچی ئەم و لەدایکبوونی مەلا گۆرانی ٩٠ ساڵ جیاوازیان هەیە.

سەبارەت بە بۆچوونەکانی سەخاوی و شەوکانیش، ڕەنگە ئەم پاشگری گۆرانی کە بە ناوی مەلا گۆرانی لکابێت، هەر بەجوگرافیایێکی دیاریکراو تێگەیشتبن.

ئەی کەواتە گومانی زێدی مەلا گۆرانی لە چییەوە سەریهەڵداوە؟ کاتێك لە سەرچاوەکان خەریکی توێژینەوە لە بارەی مەلا گۆرانی بووین، هەموو سەرچاوەکان دوای گواستنەوەی بۆچوونی ئەوەی کە مەلا گۆرانی لە شارەزوور لە دایك بووە، بەڵام زۆرێك لە سەرچاوە تورکییەکان لە کۆتاییدا یەك بۆچوونی ڕەهایان دەدا، کە ئەویش شوێنێك بە ناوی (هیللەر) سەربەناوچەی (ئێرگان) لە دەوروبەری دیاربەکری کوردستانی باکوور بە شوێنی لەدایکبوونی مەلا گۆرانی دەستنیشان کرا بوو. لە راستیدا ئەو دەرئەنجامە بۆ ئێمە زۆر سەرسوڕهێنەر بوو، چونکە تێکگیرانێکی روون و ئاشکرای لەگەڵ سەرچاوە عەرەبییەکان هەبوو، گوتمان ئەگەر ئەم زانیاریانەی سەرچاوە تورکییەکە لە بەڵگەنامەکانی ئەرشیفی عوسمانیی هاتبێ، یاخود دەستنووسێکی مەلا گۆرانی خۆی هەبێت، ئەوە بێگومان ئەو کات جگە لە تەسلیم بوون هیچ چارەیەکی ترمان نەبوو، بۆیە هەڵساین بەدواداچوونمان لەو بارەیەوە کرد، گەیشتین بەو ئەنجامەی، تاکە سەرچاوەی ئەم زانیارییە دکتۆراکەی (ساکیب یلدن)ە کە لە توێژینەوەکەی هەوڵیداوە جیاواز لە هەموو مێژوونووسەکان، شوێنی لەدایکبوونی گۆرانی بگەڕێنێتەوە بۆ ناو خاکی تورکیا کەئەویش گوندێکە

بە ناوی هیللەر، (ئێرگان).دواتـر ئـەم نووسـەرە توێژینـەوەی کـردووە کـە هیللەر گوندێکە لە باشووری دیاربەکر سەر بە قەزای ئێرگـان، لـە راسـتیدا ئەم بۆچوونەی یلدز سەرلەبەری هەڵەیە! چونکە ئەم خۆی دەڵێت من لە پەرتووکخانــەی کــۆپرو ئــەم زانیارییــەم وەرگرتــووە، و ئــەوانیش لــە پــەرتووکی (عنــوان و زمــانی ) ی بیقــاعی وەریــانگرتووە، بــەڵام وەکــو ئاماژەمان پێکرد، بیقاعی دەڵێت:لە گوندی جەلـەولا لـە ناوچـەی گـۆران لــەدایکبووە،دڵمان هــەر بــەو ئاســانییە ئــۆقرەی نــەگرت، چــۆن دەبێــت نووســەرێکی دکتۆرایــەك هەڵەیــەکی وا گــەورە بەســەریدا تێپــەڕێت بۆیــە هەوڵماندا ئەو نوسخە بە دەست خەیەن کە یلدز ئیشارەی بـۆ دەکات،هــەر چـەندە سـەری چـەند چـاپێکی جیـاوازی پەرتوکەکـەی بیقاعیمـان سـەیر کرد، هەموو هەر ئاماژەی بە جەلەولا کرد بوو، بەڵام بۆ دڵنیا بـوونی زیاتر خۆش بەختانە نوسخەیە پەرتووکەکەی بیقاعیمان دۆزیەوە، کە لە چەند ئەرشێفێکی عوسمان یـدا هـەڵگیراوە و هـەمان بۆچـونی ئێمـە پـشت راستدەکاتەوە:

Bikâi'nin 'Unvanu'z-zamân adlı eserinde Molla Gürani'nin Hilarlı oluşuna dair sayfa (İlgili kısım 16. satırda geçmektedir) (Köprülü Kütüphanesi No:1119 ،vrk:12-13)

ئەم بۆچونەی یلدز بە تەواوی لە نووسینی میژوونووسەکانی تورك رەنگی داوەتەوە،کە تـا ئێستا ئەمـەش بـۆ ڕاسـتییەکی حاشـاهەڵنەگر لـە مێـژووی سەرچاوە تورکییەکان، بەشێکی تر لە میژوونووسەکانی تورك بـە مەبەسـت زێدی مەلا گۆرانیان گەڕانەدۆتەوە بۆ سوریا، گوایە لـەوێ لـە گونـدی گـۆران لەدایکبووە. لەبەر ئـەوە زەحمـەت لـە ئێستادا بتـوانین شـوێنیکی تـەواو و دروست بۆ مەلا گۆرانی دەستنیشان بکـەین، بـەڵام دڵنیـاین لـەوەی کـە لـە شارەوزوور لەدایکبووە.

لەگەڵ ئەوشدا دەگونجێت بۆچونێکی نوێتر لەبارەی شوێنی مەلا گـۆرانی بـدەین، ئـەویش لـەپاڵ هـەڵگرتنی نازنـاوی هۆزکـەی گـۆرانی، نازنـاوی

(مـەلا)شـی وەکـو پێـشگرێك زیـادکردووە، ئەمـە بەڵگەیـەکی باشـە تـاوەکو گومانەکەمان تـۆختر بکاتـەوە،  کـە مـەلای گـۆرانی سـنوورەکەی نزیکـە لـە ئەدەبیاتی فارسی؟ چونکە ووشەی (مەلا) تـەواو وشـەیەکی فارسـییە لـەلای کوردیش لەوانەوە بۆمان گوازراوەتەوە، بەڵام  عەرەب ووشـەی (شـێخ )یـان بەکارهێناوە لای زانا تورکەکانیش (هۆجـە)یـان بـۆ بـەرکاهێناوە، بـۆ نمونـە زانایەکی زیرەك و بلییمەتی وەکو مەلا نەسرەدین کـە لـە  سـاڵی ١٢٠٨ز لـە دەووروبەری شاری کۆنیا لەدایکبووە،  لە ١٢٨٤ز لە ئاکشەهیر کۆچی دوایی کـردووە [١].  ئـەم زانایایـە لـە ئـەدەبیاتی تـورك بـە نـصرالدین خواجـە یـا نصرالدین هۆجە  ناوی دەر کردووە، بەڵام  هەمان ناو لە ئەدەبیاتی فارسـی و کوردی بە مەلا نەسرەدین  بە مەلا مەشـهور  بەناوبانگـە، و لـە ئـەدەبیاتی عەرەبیش نەسرەدین (جحا).

## ١.   ٥:ساڵی لەدایکبوونی مەلا گۆرانی:

سـەبارەت بـە سـاڵی لەدایکبونەکەشـی، ئـەوە سەرچـاوەکان لەیـەکتر نزیکن، ساڵی ٨١٣ کۆچی بەرامبـەر ١٤١٠ زایینـی، بـە سـاڵی لـەدایکبوونی مـەلا گـۆرانی دیـاری کـراوە.[٢] نـەتها مـەقریزی بۆچـونی لـەو بارەوەیـەوە جیـاوازە، ئـەو بۆچـوونی  وایـە، کـە گـۆرانی لـە ١٣ ربیـع الاول ٨٠٩ ك لەدایکبووە.[٣]

[1] Zekerya BATUR ; NASREDDİN HOCA FIKRALARINDA DEĞER YARGILARI VE EĞİTİM  2012, ANKARA-TURKEY S 585.

[2] السیوطي : ص ٣٨ ، البقاعي : ص ٦٠، الشوكاني : ص ٣٩ ، الزركلي : ص ٩٧ ، السخاوى : ص ١٧ . تقي الدين الغزي : ص ٣٢٢ .

[3] المقريزى : ص ٣٦٣

## ١. ٦ :گەشتی ژیانی و بونیادنانی کەسایەتی خۆیی:

بەداخـەوە نـەمانتوانی بـەو ئەنجامـە بگـەین، کـە ئـەو ناوچـەیەی مـەلا گۆرانی لەدایکبووە، کام شارە، لە نێوان سێ هەڵبژاردەی گوندی (گـۆران) و (جەلـەولا) و شارۆچـکەی (شـاروەزور) بـێ چـارە ماینـەوە، لەگـەڵ ئەوەشـدا توانیمـان دووبـارە گـۆرانی ئاشـنا بکەینـەوە بـە سروشـتی جوانی شارەزوور، دڵنیایمان بە خوێنەردا، کە شارەزووی پـان بـەرین ئـەو هەرێمەیە گۆرانی تیادا هاتۆتە دونیا، با یەکلایکردنـەوەی ئـەم بابەتـە بـە کەسێکی تر بسپێرین و هیوادارین ئەم بابەتـە لـە داهـاتوودا بۆمـان سـاغ بکاتەوە، بەر لەوەی باسی گەشتەکانی مەلا گۆرانی بکەین، گرنگە باسـێك لە بارەی باردۆخی ئەوکاتی ناوچەکە بکەین، بزانین بارودۆخی ئەوکاتەی شـارەزوور لـە ڕووی سیاسـی و زانـستی و کۆمەلایەتیـەوە چـۆن بـووە، حەڤـدە سـاڵ لەبـەر لـەدایکبوونی مـەلا گـۆرانی واتـە سـاڵی ٧٩٦ ك، کوردستان ڕووبەڕووی هێرشی (تەیموری لەنگ) بویەوە، تـەیمور پیـاوێکی تا بڵێی ترسناك و خوێنڕێژ بـوو، هەرچـی ڕووبـەڕووی ببوایـەوە، لـە نـاوی دەبـرد، هـەر شـارێك ملکەچـی خـۆی ڕانەگەیاندبوایـە، وێرانـی دەکـرد، رەحمـی بـە هـیچ کـەس نـەدەکرد، لـەو کاتـە کوردسـتان بەسـەر چـەند ناوچەیەك دابەش ببوو، هەر میرێك لە سەر گـرد و تەپەپۆڵکەیـەك حـوکمی دەکرد، کوردەکـان نـەیانتوانی بەسـوپایەکی بـەهێز بـەرەنگاری ببنـەوە، ناچـار زۆربـەی میرەکـانی هـەولێر و حەسـەن کێـف و مـاردین و جزیـرە و هـەموو ناوچـەکانی بـەتلیس و ئـەخلات و مـوش، ملکەچـی پێـشوەختەی خۆیان بۆ (تەیمور) راگەیاند و کلیلی دەرگای قەڵاکانی خۆیان پێشکەشی

کرد، لەبەرامبەری ئەمە هەموویانی بەخشی و لە ناوچەکانی خۆیان بە سەرداری مانەوە. سەرداره میرەکان بەم کارەیان توانیان هەرێمە کوردنیشنەکان لە کاولکاری شەڕ بپارێزن. لەولاشەوە سوڵتانی عوسمانی (بایەزید خان) خەریکی فراوان خوازی بوو، بەرەو قولای ئەورووپا و توانیبووی تا هەنگاریا بگرێت، لە هەمانکاتدا ئابلوقەیەکی توندی خستبووە سەر شاری قوستەنتنیە، بەڵام زانی فراوانخوازیەکانی (تیمور) گەیشتۆتە حاڵەتێکی ترسناك،توانی بووی دەتبگرێت بەسەر نیوەی جیهانی ئیسلامی، تەنانەت بەغدای پایتەختی عەباسیەکانیشی گرتووە، ناچار هەڵمەتەکاتی لە ئەورووپا ڕاگرت و کەوتە ڕووبەڕووبوونەوەی سوپاکەی تەیمور، هەردولا کەوتنە نامە ناردنی هەڕەشە و پڕ لە سوکایەتی بۆ یەکتری، هەردوو لا لەو پەڕی بەهێزی دابوون، هەر بۆیە تەیمور بە سوپایەکی ١٠٠ هەزار کەسی ڕووی لە پایتەختی عوسمانی کرد، لەولاشەوە بایەزید لەگەل هاوپەیمانی ئەورووپی کەوتە رێکەوتن و سوپاکەی کۆکردەوە و بەرەو ڕووی سوپاکەی تەیمور کەوتە ڕێ. سولتان یابەزید بە سروشتی خۆی پیاوێکی ڕەزیل و قرچۆك بوو، سەرەڕای پڕی خەزێنەکەی، بەڵام موچەی سەربازەکانی زۆر کەم و درەنگ دەدا، هەرچەندە عەلی پاشای وەزیر تکای لێکرد، کە دەرگای گەنجینەی وڵات بۆ سەربازەکانی وەڵا بکات، نەچێتە شەڕی ڕاستەوخۆی سوپاکەی تەیمور، بەڵکو شەڕی پارتیزانی لە چیاکان دژی بکات، چونکە سەرەڕای کەمی ژمارەی سوپاکەیان، کە نزیکەی ٢٠ هەزار دەبوو، لەهەمان کاتدا سوپایەکی ماندووشی هەبوو، بەڵام سوڵتان بایەزید هیچ بایەخی بە

تکاکەی وەزیـر نـەدا. تـەیمور دەستپێـشخەر بـوو لـە هەڵبـژاردنی شـوێنی شـەڕ، لەتـەك ڕووبـاری (جوبـوق ) لەشـکرەکەی دامـەزرێنێت و بەمـەش تـوانی ئـاو لـە سـوپای بایەزیـد دابڕێـت. لـە ٢٠ تمـوزی ١٤٠٢ سـوپایی عوسمانی شسکستی هێنا، بایەزید بە دیلی کەوتە دەست تەیمور لەنگ [1].

دوای سـێ سـاڵ ١٤٠٥ تـەیمور دەمرێـت و شـەری نێوخـۆی بنەماڵـەی تەیمور لە نێوان کوڕەکانی سەرهەڵدەدات، بەمەش دەسەلاتێکی نـوێ لـە ناوچەکە دورست دەبێت، کـە ئـەویش هـۆزێکی تورکمـان بـوو، بـە نـاوی قەرەقۆینلۆ (مەڕی ڕەش )

ئەم هێزە بەسەرکردایەتی قەرە یوسفی کوڕی قەرە موحەمەد، لە سـاڵی ٨٠٥ کۆچی توانی بەشێك لە ناوچە کوردنیـشنەکان تـا وەکـو ئـەزەربێجان بخاتە ژێر فەرمانڕەوایی خۆی.

لــە لایــەکی تریــشەوە هێزێکــی هاورەگــەز و هاونــەژادی قــەرەقۆینلۆ سەریهەڵدا ئەویش هۆزی ئاق قۆینلۆ (مەڕی سپی ) بوو، ئەمانیش توانیان بەشـێك لـە کوردسـتان بخەنـە ژێـر دەسـەلاتی خۆیـان بەتایبـەتی شـاری دیاربەکر بەسەر کردایەتی ئەبو نەسر ئەمین حسن بەگ.

دوای پێنج ساڵ واتە ١٤٠٧ ز و دوای مردنی تەیمور جاریکی تر ناوچـە کورد نشینەکان رووبەری و سوپای شاهرۆخ میرزای کوڕی تیمور بوونەوە، بەهــەمان شـێوەی پێـشوو هــەموو مــیرە کوردەکـان ملکەچـی خۆیـان راگەیاند، بەمەش خاکی کوردان کەوتە نێوان دوو هێزی شەڕخواز و هێزی

---

[1] ئیبراهیم داقوقی ، کوردی تورکیا ، وەرگێرانی هیمەت کاکـەیی ، دەزگـای موکریـان هـەولێر ٢٠١٢ ، لا ١٢٢-١٢٥

قەرەقۆینلۆکان بە خێرای فراوان بوو، و توانی دیاربەکر سیواس لە ژێر دەستی ئاقۆینلۆ دەربهێنی، لە ولاشەوە بەغداش بخەنەژێر دەسەڵاتی خۆیان.

بەهاتنی پیاوێکی بەهێز و باڵابەرزی وەکو (ئوزون حەسەن) لە پاشماوەی میرانی ئاق قۆینلۆ، توانی هێزەکانی ناوچەکە هەموو ڕابماڵێت و خۆی وەکو تاکە هێز بمێنێتەوە، لە ساڵی ١٤٠٧ ز هەموو میرنیشنە کوردییەکان ناچار بە ملکەچیان بکات و بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی[1].

کەواتە مەلا گۆرانی لە باردۆخێکی پڕ لە شەڕو ململانی نێوان هێزەکان لەدایکبوو، سەرەتای منداڵی هەر لەژێر چاودێری خێزانەکەیدا بووە،مەلا گۆرانی لە ناوچەکەی خۆیی زانستە سەرەتاییەکانی ئەوکاتی خوێندووە،سەرچاوەکان هیچ ئاماژەیەکی ئەتۆ ناکەن بەوەی کە کامە زانستی خوێندوە، ئەگەر بە گویرەی ئاماژەکان بێت، مەلا گۆرانی لە ناوچەکەی خۆی تەواوی قورئانی پیرۆزی لەبەرکردووە،[٢] بەڵام ئەگەر گۆرانی تا ئەو ڕادەیە چووبێت قورئانی هەموو لەبەر کردبێت، دەبێت تەواو فەهمی کردبێت، بۆ ئەوەی قورئان بەباشی بخوێنێتەوە، پێویست بووە کە فێری سەرەتای ئەلفوبێی زمانی عەرەبی ببوبێت، ڕەنگە لەپاڵ ئەمانەش وەکو هەندێ لە سەرچاوەکان ئاماژەی بۆ دەکەن، زانستی فەرمودە و بنەمەکانی و فیهی سەرەتای خوێند بێت. دواتر بۆ ئەوەی زیاتر پەرە بە خوێندن بدات، گۆرانی لەلان خێزانەکەی دەنێردرێتە

---

[1] هاشم حیجازی فەر ، شا ئیماعیل و جەنگی چالدێران ، وەرگێرانی کەمال رەشید ، چاپخانەی رۆشنبیری سلێمانی ٢٠٠٢ ، لا ١٩–٢٠.

[2] سخاوی ، ص ٢٤٢ ، شوكانی ، ص ٣٩ ، بقاعی ، ص ٦٠ ، امین زكی ، ص ٢٣٤.

ناوچـەی جـەزیرەی ئـیبن عومـەر لـە بـاکوری کوردسـتان، لـەویٚ لـەلای مامۆسـتا عەبـدولڕەحمان جـەلالی، زانـستەکانی (معقـولات و الاصـلین)، مـەنتق، ئەمـە جگـە لـە ڕستەسـازی (نحـو )و واتاسـازی (معـانی) و ڕەوانبێژی (بیان)، لەگـەڵ زانـستەکانی فیقـی ئیـسلامی تـەواو دەکـات [1].

مـەلاگۆرانی لـەم ماوەیـەدا تـوانی بەتـەواوی زانـستە سـەرەتاییەکان فێـر ببێت، کە پێویست بـوو هـەموو قوتابیـەکی ئـەو سـەردەمە ئـەم زانـستانە بخوێنیٚ، سەرچاوەکان هەموو ژیانی زانستی مـەلا گـۆرانی بـە نیـو لاپـەرە ئاماژەیـان پێکـردووە، هـەر چـەندە پـچرێکی زۆریـش هەیـە لـە نێـوان سەرچـاوەکا، تـەنها (بیقـاعی) نـەبیت کـە چـەند شـوێنێکی مـەلا گـۆرانی دیـاری کـردووە، وەکـو ئاماژەمـان پێکـرد بیقـاعی یەکـەم وێستگەی ئـەو شوێنەی کە مەلا گۆرانی کۆچی بۆ کردووە، بە جەزیرەی دیـاری کـردووە، لەگەڵ ئەوەشدا سەرچـاوەکانی تـر کۆمـەلێك زانـستی بـەهێزمان بـۆ بـاس دەکەن،کە گوایە مەلا گۆرانی خوێندوویەتی، بەر لەچوونی بۆ جـەزیرەی ئیبن عومەر، هاوکات لەگەڵ ئەوەش هەر یەکە لە سەخاوی و شەوکانی و مەقریزی لە نازناوەکەی گۆرانی ئاماژە بە هەردوو شاری تەبرێز و هەمەدان دەکەن، بۆیە دەکرێت گۆرانی ماوەیـەك لـەم دوو شـارەش خوێندوویـەتی، کە دواتر لە قاهیرەش درێژە بە زانستەکانی حاشیەی (تەفتازانی) و (علمی الکشاف ) و (قرئاتی سبع شاتبی ) و (فیقهـی ئیمـامی شـافیعی ) بـدات، [2] ماوەیەکیش لە شاری بەغدا خوێندوویـەتی، بـەڵام سـەبارەت بـە مانـەوەو

---

[1] البقاعی ، ص ٦٠.

[2] شەوکانی ، ص ٣٩

چۆنیەتی خوویندنی لەم شارە، هیچ زانیاریەك بەردەست نییە،تەنها ئـەوە نەبێت کە  سەخاوی و مەقریزی ئاماژە بـە مامۆسـتایەکی ناوچـەی مـەلای گۆرانی دەکەن بەناوی زین کوڕی عەبـدولرەحمان کـوڕی عومـەر قـەزوینی بەغدادی  کە هەردوو زانستی (قرئاتی سبع)و (حفـزی قورئـانی) بـە  مـەلا گـۆرانی کـردووە،    دواتـر روو لـە شـاری حەسـەن کیـف دەکـات هـەر لـە کوردستانی باکور،  لەلای مامۆستا جەلە دین حلوانی درێژە بـە فێربـوونی زمانی عەرەبی دەدات، دواتر دەچێتە چەند ناوچەیەکی وەکو ئەرغۆنی [1] و خنوس نزیك دیاربکر، مەلا گۆرانی لەو ناوچـانەی خوێنـدنی تیـادا دەکـرد، زۆر نارەحەت دەبێت، بە تایبەت بە هۆی ئـەو هـەموو ململانێیـەی نێـوان دەوڵەتی ئـاق قۆینلـۆ و قـەرەقۆینلۆ، گرینگـی نـەدانی ئـەمان بەزانـست و دواکـەوتوویان بـە جۆرێـك وای لـە مـەلا گـۆرانی کـرد، کـە ناوچـەیەکی تـر هەڵبژێرێت  دوور بێت لە دەسەڵاتی ئاق قۆینلۆکان، بۆیە بـیری کردۆتـەوە بچێت بۆ وڵاتی شام.

---

[1] خنوس بە ئەرمەنی ( Xnus ꞃuꞃ n ʟ u )و بە تورکی (Hınıs) شارۆچکەیەکی کوردنشینە و مەرکەزی قەزایەکە سەر بە پارێزگای ئەرزەرۆم کە بە هـەرێمی سـەرحەدان ناودەبرێت و نزیکەی ٢٧ هەزار کەس دەبن و ئاخاوتنیان بە کرمـانجکی/kirmanckî) کوردکی زازۆیـی) و کورمانجیە .(kurmancî) نزیکەی ١٤٥ کیلۆمەتر لە مەرکەزی ئەرزەرۆم دوورەو ١٧٢٠ مەتر بەرزە لە ئاستی دەریا. خنوس زۆر کەونارایەو شوێنە ناسراوەکانی بریتین لە قەلای خنوس (Kela Xinûsê)و قـەلاتـی زەرنـاکێ (Kela Zernakê) و مزگـەوتـی دێرینـی ناسـراو بـە مزگەفتا میرێ مووشێ(Mizgefta Mîrê Mûşê)

### ١. ٧:قۆناغی شام و قودس:

ئەوكاتەی مەلا گۆرانی بەمەبەستی خوێندن ڕوو لە شام و قودس دەكات، ماوەی حوكمڕانی دەسەڵاتی مەمالیك بوو، مەمالیكەكان بەو هێزانە دەگوترێن كە توانیان كۆتایی بە دەسەڵاتی ئەیوبی بهێنن و بەتەواوی بوونە میراتگریان، بەمەش دەوڵەتی مەلیك لە ساڵی ١٢٦٠ ز، توانیان هەژموونی خۆیان بەسەر حیجاز و یەمەن و میسرو شام بڵاوبكەنەوە، بوونە بەربەستێك لەبەردەم ئەو هەڕەشانەی لەلایەن خاچپەرستان و مەغۆلەكان ڕووبەڕووی جیهانی ئیسلامی دەبوویەوە، مەمالیەكان لە دوو بەش پێكهاتبوون، ئەوانیش مەمالیكی (بەحری) كە دامەزراندیان بۆ ساڵی ١٢٤٩ز دەگەڕێتەوە، كاتێك (لویسی نۆیەم) پاشای فەڕەنسا هێرشی كردە سەر میسر، توانیان شكست بە سوپاكەی لویس بهێنن و خودی پاشا بە دیلی بگرن، مێژووی پڕشنگداری گەورەی مەمالیەكان ئەوكاتە بوو كە لە ساڵی ١٢٦٠ ز توانیان بەر بە سوپایی مەغۆل بگرن، بەسەركردایەتی (سەیفەدین قوتز) شكستێكی گەورە بە مەغۆلەكان لە شەڕی (عين جالوت ) بهێنن، بەمەش توانیان بۆیەكەمجار لە مێژوو، سوپای تۆقێنەری مەغۆل لەبەردەم جیهانی ئیسلامی چاوشكێن بكەن، كە هاوكات سەردەمی قارەمانێتی زاهیر بیبرس هاتە كایەوە[1].

سەبارەت بە مەمالیكی بورجیش، لە راستیدا دەركەوتنی ئەمانە پەیوەستە بە سوڵتان قلانەوە، كە توانی دەستەیەك لە هێزی تایبەت بە

---

[1] السير وليم موير : تاريخ دولة المماليك في مصر ، ترجمة: محمود عابدين – سليم حسن ، مكتبة مدبولي ، الطبعة: الاولى ١٩٩٥م ، ص ٤٧

خۆی پێکبهێنی، لەو کەسانەی ڕەگـەزیان چەرکەسـی خـەڵکی قـەوقازیا بوون، ناوەکەشیان هەر لەوە هاتبوو کە ئەوانە زیاتر بە بورجی قەڵاکان و کاری چاودێری پەیوەست بوون، توانیان دەسەڵاتی خۆیان بە هێـز بکـەن و دژی مەمالیکەکانی بەحری ڕاپەڕن، لە ساڵی ١٣٨٢ ز کۆتاییان پێبهێنن، بەمەش مەمالیکی بورجی دامەزرا [١].

مەلا گۆرانی نائاگا نەبوو لەوەی حاڵ و بـاردۆخی سیاسـی شـامیش لـە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی قەرەقۆینلۆ باشتر نییە، چونکە بەچەند ساڵێکی کەم بەر لەو ماوەیە، واتە لە سـاڵی ١٤٠٢ ز، تـەیمور لـەنگ تـوانی تـەواوی شام و حەلەب دەستبەسەردا بگرێـت، دوای تـەیموریش مەترسـیەکی نـوێ ڕووی لـە شـام و میـسر کـرد، ئـەویش چـاوتێبڕینی ئـەم ناوچـانە لەلایـەن کۆمارەکانی ئیتاڵیا بۆ سـەپاندنی هـەژموونی بازرگـانی کەوتنـە ڕکابـەری ناوخۆ، کە دواتر بە ڕێکەوتننامە لە نێوان مەمالیك و ئەورپییەکان کۆتایی هات، دوای ئەوە لە ساڵی ١٤١٢ ز، دووبارە هەیمەنـەتی زیندووکردنـەوەی خەلافـەتی عەباسـی هاتـە کایـەوە و خەلیفـە موستەعـسین بـۆ ئـەم کـارە دەستنیشان کرا، هەرچەندە ئەم کارە تەنها لە ڕێوڕەسمێکی شانۆگەریە دەچوو، بۆیە خەلیفە کاتێك ویستی دەسەڵاتی حەقیقی خۆی بەکاربهێنێ، ئەوا ڕاستەوخۆ لەلایەن شێخ موئەید لە نێوان ساڵانی ١٤١٢–١٤٢١ز هەموو نەیارانی لەناو برد[2].

---

[1] السير وليم موير : ص ٦١–٦٢

[2] السير وليم موير : ص ١٣٩

دوای مردنی شیخ موئەید، شام بەتەواوی بارودۆخی تێکچوو، ڕاپەرین و جولانەوە لە هەموو شوێنیکی ناوچەکە سەریهەڵدا، لەگەڵ ئەوەشدا تا ڕادەیەك لە بەختی مەلا گۆرانی، لەو سەردەمەی کە بۆ خوێندن ڕووی لە شام و قودس کرد، ئارامی باردۆخەکە هاندەرێکی باش بوو وا لە مەلا گۆرانی بکات دوودڵ نەبێت لە ڕووکردنە ئەوێ، ئەمەش هاوکات بوو لەگەڵ هاتنە سەرکاری سولّتان (برسباری) لە نێوان ساڵانی ( (٨٢٥-٨٤١ (١٤٢٢-١٤٣٨ز)، هەرچەندە لە سەردەمی ئەو سولّتانە خراپی بارودۆخی ئابووری هەمیشە لە بارێکی مەترسیدار داربوو [١]، سەرەڕای ململانیی قووڵی مەمالیك لەگەڵ هەموو نەیارانیان لەو ماوە درێژە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان هێشتا پێشکەوتوو تر بوون چ لە ڕووی سیاسی و سەربازی و پەروەردەییەوە بە بەراورد لەگەڵ دەوڵەتانی ئاق قۆینلۆ و قەرە قۆینلۆ، ئەمەش نهێنی مانەوەی ئەو ماوە دوورودرێژەی مەمالیکەکان بوو، ئەوان لەگەڵ ئەوەی دەوڵەتێکی سەربازیی بوون، بەڵام لەژێر کاریگەری ئەمەوییەکان و زەنگییەکان و پاشان ئەیوبییەکان گرنگییەکی تایبەتیان بە زانست و زانیاری دەدا، زانایان لای سولّتانەکانی مەمالیك ڕێزێکی تایبەتیان هەبوو، خاوەنی چەندین قوتابخانەی ئایینی بوون. بەتایبەت لەسەردەمی سولّتان برسبای کە لە ڕێکخستنی شێوەی کارگێری سەربازیی زانایانی ئایینی لە بەڕێوەبردن ڕۆڵێکی گەورەیان گێڕاوە.[٢]

---

[1] السير وليم موير : ص ١٤٧

[2] مجاهد محمد : الحياة العلمية في الدولة المامالك البحرية ، سودان ٢٠١١ ، ص ٤٠

ئەم باردۆخەی ئەوکاتەی شام و قودس هاندەرێکی باش بوو بۆ ئەوەی مەلا گۆرانی ڕوو لەو ناوچانە بکەن، بە تایبەتی ئەو دوو ناوچەیە کە کانگای هەڵقوڵانی پێغەمبەران بوو، بە گوێرەی زۆربەی گێڕانەوەکانی مێژوو، ئەو کاتەی مەلا گۆرانی روو لە شام دەکات، ساڵی ٨٣٠ ك بوو، واتە ئەو کاتە تەمەنی لە نێوان ١٧تا ١٨ ساڵی بووە،بەڵام ڕەنگە ئەمە هەر بە نزیك کراوەیی بێت ! چونکە بە گوێرەی (بیقاعی) و (سەخاوی) و (شەوکانی) بێت دەڵێن:

لە دەوروبەری ساڵانی هەشت سەد و سییەکان، واتە بە تەواوی دڵنیایان نەداوە کە ئاخۆ گۆرانی بە تەواوی ساڵی چەندی سییەکان بووە، ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئاق قۆینلۆی جێهێشتبێ و هاتبێتە شام،[1] لەو ماوەی لە شام دەمێنێتەوە، زانایەکی بەناوبانگی بە مەزهەب حەنەفی لە شام نیشتەجێیە، کە ئەویش عەلائەددین بوخارییە، ئەم زانایە ناوی علی یاخود محەمەدی کوڕی محەمەد کوری شێخ علا الدین حەنەفیە، لە سالی ٧٧٩ ك لەدایکبووە، خوێندنی سەرەتایی لە لای خاڵی و باوکی بووە، دواتر بۆ تەواوکردنی خوێندنی زانستە عەقڵی و نەقلیەکان و معانی و بیان ڕوو لە وڵاتی هیندستان دەکات، ماوەیەکیش لە قاهیرە نیشتەجێ دەبێت، ئەم زانایە ناوبەنگی بە خواپەرستی و خۆ بەکەم زانیی دەرکرد بوو. هیچ کاتێك موجامەلەی دەسەڵاتدارانی نەکردووە هەمیشە حەقی بە ڕوویانداداوەتەوە، کاتێك لە مەجلسی پادشاکان بووایە، ئامۆژگاری دەکردن بە دادپەروەریی و لە خوا ترسان عەلائەددین بوخاری

---

[1] البقاعي ، ص ٦٠ . سخاوی ، ص ١٧ . شوکانی ، ص ٣٩ .

زۆربــەی ژیــانی لــە ملمــەلانێی زۆرداری و بەربــەرەکانییکردنی گەنــدەڵی بەسەر بردووە، لە ساڵی ٨٤١ ك لە شام کۆچی دوایی کردووە.

ڕەنگە ئەم زانایە لە شام یەکەم مامۆستایی بەناوبانگی مەلا گۆرانی بێت، لــەم ماوەیــەی کــە لــەلای خوێنــدووە، کاریگــەری زۆری لەســەر هەڵسوکەوت و ژیــانی مــەلا گــۆرانی جێهێشتووە.بــە تایبــەت لــە سڵ نەکردنــەوەی ئــەوەی حــەقی بــە ڕووی دەســەڵاتداراندا داوە، دواتــر لــە هەڵسوکەوتکردنی مەلا گۆرانی لەگەڵ محەمەد فاتیح ئەم خاڵە بە روونی تێبینــی دەکرێت، وەك سەخاوی دەڵێت مەلا گۆرانی بەهۆی بۆچوونە جوانــەکانی و زیرەکییەکــەی، مــەلا گــۆرانی عەلائــەددینی بــە هــەموو زاناکانیتر بە پایە بەرزتر دەدانا، هەرچەندە سەرچاوەکان تەنها باسی ئەم زانایەیان کردووە، کە مەلا گۆرانی لە شام وانەی لەلا خوێندووە.

دواتر مەلا گۆرانی لەگەڵ مامۆستا کۆنەکەی شاری حەسەن کیف، جلال حلوانی پێکەوە ڕوو لە شاری قودس دەکەن، هەر لەلای حلوانی دەستدەکات بە تەفسیری (کشاف) ی زەمخشەری، کە بە شێوازێکی ڕەخنەیی دەخوێنێت، ماوەی پێنج ساڵ لە قودس دەمێنێتەوە، دوای حاشیەی تەفتازانی وانە بنچینەییەکانی تەفسیری لە تەمەنی ١٨ تا ٢٠ ساڵی دەست پێکردوە، هەندێ تیگەیشتنی سەرەکی لە زانستەکانی عەقلّی و نەقلی لە کۆڕی وانە زانستیەکاندا بە یارمەتی ئەو مامۆستایەی، پاشخانە ڕۆشنبیرەی وەریگرتبوو، توانی بگاتە ئەو ئاستەی گویّ بۆ بیر و بۆچونەکانی وەربگیریّ[1] .

---

[1] Yıldz , s 30-31

## ١.    ٨:ژیانی زانستی مەلا گۆرانی لە میسر:

دوای مانـەوەی مـەلا گـۆرانی بـۆ مـاوەی پێـنچ سـاڵ لـە شـام و قـودس، بڕیاریـدا بـە مەبەسـتی تـەواوکردنی خوێنـدن ڕوو لـە شـاری قـاهیرە بکـات. قاهیرە بۆ کەسـایەتی مـەلا گـۆرانی شـارێکی نـامۆ نـەبوو، وەکـو لـەبارەی هۆزی گۆران باسمان کرد، کە لە سەردەمی دامەزراندنی دەوڵەتی ئەیوبی لـە سەردەستی سەلاحەدین کوردەکـانی، هـۆزی گـۆران لـە شـارەزوور و موسـڵ کۆچیان کرد بۆ قاهیرە، مەلا گۆرانی لـە سـاڵانی (٨٣٥ك) پێدەخاتـە شـاری قاهیرە و لەوێ دەستدەکات بە تـەواوکردنی زانـستە ئاینییەکان،ئـەو کاتـەی مەلا گۆرانی دەچێتە قاهیرە، سەردەمی فەرمانڕەوای سوڵتان برسـبای بـوو، سەرەڕای خراپـی بـارودۆخی ئـابووری لـەو کاتـەدا، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا برسبای توانیبووی سەقامگیری بۆ وڵات فەراهەم بکات، کە دوای تێپەڕاندنی قــەیرانی ئابوورییەکــە دەســتی کــرد بــە فراوانکردنــی ســنووری وڵات، تــا دورگــەکانی قـوبرس و ڕۆدۆس قـەڵمڕەویی دەوڵـەتی مـەمالیك خـستە سـەر نەخــشەی سیاســی، بــەڵام بــەهۆی نەخۆشــییەوە نــەیتوانی درێــژە بــە فراوانخوازییەکی بدات و لە ساڵی (٨٤١ك )کۆچی دوای دەکات[1] .

مەلا گۆرانی هەمیشە نەریتی وا بوو کاتێك ڕووی لە هـەر شـارێك یـاخود ناوچەیەك بکردایە، ئەوە لە بەناوبانگترین و زاناترین کەسی ئەوەی شـارە دەپرسی ئینجا دەچووە لای و خـۆی دەکـرد لـە زانـستەکانی بەهرەمەنـد،

---

[1] سوهیل توقوش ، ل ٣٩٢ ة

بۆیــە کاتێـك دەچـێتە قــاهیرە ڕاســتەوخۆ پەیوەنـدی بـە گـەورە زانـا و فەرمودەناس ئیبن حەجەری عەسقەلانی دەکات.[١]

مەلا گۆرانی باش لەوە گەیشتبوو کـە هـیچ کـەس نییـە لـەو سـەردەمە شان لە شانی ئیبن حەجەر لـە بـواری فـەرموودە دا بـدات، بۆیـە دەسـتی کرد بە خوێندنی فەرموودەکانی سەحیحی موسـلم و بوخـاری و شـاتبی و لەگـەڵ فێربـوونی زانـستی فەرموودەناسـی (روایـە و درایـە ) و شــەرحی ئەلفیەی عێراقی تا تەواو کردن و ئینجـازەی زانـستی فـەرموودەی لای ئیبن حەجەر وەردەگرێت.[٢]

مەلا گۆرانی بۆ ئەوەی زیـاتر لـە زانـستی فـەرموودە قـووڵ ببێتـەوە، شتێکی نوێ و زیاتر فێر ببێت. بۆیە جگە لای ئیبن حەجەر، ماوەیەکیش لای زانـای ناسـراو زینـە دیـن زەرکەشـی، سـەحیحی موسـلم بـە تـەواوی دەخوێنێت، لەپاڵ ئەمەشدا سوودی لە زانیارییەکانی شێروانی وەرگرتـووە

---

[1] ئیبن حەجەر ناوی شەهابەدینی کوڕی ئەحمەد کوڕی عەلییە، لە هۆزی عەسقلانە و لـە سـاڵی ٧٧٣ ك لە دەوروبەری قاهیرە لەدایکبووە ، لە بنەماڵەیەکی شـافعی مەزهـەب پـەروەردە بـووە ، بەمەبەسـتی خوینـدن ڕوو لـە شـاری مەککـە دەکـات و ماوەیـەکیش لـە فەلەسـتین نیـشتەجێ دەبێـت ، لـە زانـستە ئاینیەکان زانیارێکی زۆر فراوانی دەبێت، بە تایبەتی لە زانستی فەرمودە تا ئەو رادەیە نازناوی پیشەوای فەرمودەناسان وەردەگرێت ، دەیان پـەرتووك و بەرهـەمی لـە بوارەکـانی فـەرموودە ، ژیاننامـە و فقـه داناوە ، لـە سـاڵی ٨٥٢ ك لـە میـسر کۆچـی دوای دەکـات ، بـە ئامـادە بـوونی سـوڵتان و وەزیرەکـانی دەوڵەت و زانایان و قوتابیانی هەر لەوێ بە خـاکی دەسـپێرن ابـن حجـر العـسقلاني، أحمـد بـن علـي- الموسوعة العربية الميسرة، 1965

[2] القریزی ،ص ٣٦٤ . شوکانی ، ص ٣٩ . عبدالکریم المدرس ، ص ٦٩. امین زکی ، ص ٢٣٤ .سخاوی ، ص ٢٤١ . طاشکبیری زادة ص٥١

و هــەر یەکــە لــە پەرتووکــەکانی شــاتیبی و صــەحیحی موســلمی لــە لا دوبارەکردۆتەوە [١].

جگە لە زانستی فەرمودە، مەلا گۆرانی گرنگی بە بواری فقهی ئیسلامی داوە، ماوەیەك وەکو قوتابی عەلائەددین قلقشندی دەرسی خوێندووە [2].

لە بواری زمانەوانیش تەواو قولْبۆتەوە، بە تایبەتی زمانی عـەرەبی کـە زمانی نوسین و قسە کردن بووە لەو سەردەمە، تاشـکۆپەری زادە ئامـاژە بەوە دەکات کە مەلا گۆرانی لە پالْ زانستی فەرموودە و فقهی ئیسلامی، گرنگی داوە بە لایەنی زمانەوانی، و بـۆ ئـەم مەبەسـتەش (القـرات العـشرة بطريق الاتقان و الاحكام ) خوێندووە [3].

## ١. ٩ :تێکەڵی مەلا گۆرانی بە کاروباری سیاسەت و حوکمڕانی :

یەکـەم وێـستگەی سیاسـی مـەلا گـۆرانی لـە قـاهیرە دەسـتپێدەکات، سەرچاوەکان هیچ ئاماژەیەك بەوە ناکەن کە لە ناوچـەکانی خـۆی یـاخود شـام و قـودس تێکـەڵ بـەکاری سیاسـی بـووبێ، مـەلا گـۆرانی لـەو کاتـە سەرەڕای بچووکی تەمەنی، بەڵام گـەنجێکی وریـا و زیـرەك بـوو، لەگـەڵ فێربـوونی زانـستە ئاینییـەکان وردە وردە تێکـەڵ بـە کـاری سیاسـیش دەبێت، پەیوەندی بە پیاوانی دەوڵەتی مەمالیك دەکات، دەیزانـی چـۆن و لای کێ دەبێت دەرس بخوێنی هەر بۆیە ئیبن حەجەری وەکو مامۆسـتا دیـاری دەکـات، سـەرەڕای زیرەکـی و لێهـاتووی ئـەم فەرمودەناسـە، لـە

[1] شوکانی ، ص ٤٠

[2] سخاوی ، ص ٢٤١ . شوکانی ، ص ٤٠

[3] ص ٥١

هەمان کاتدا پیاوی دەوڵەتیش بوو، ئەو لەپاڵ پیشەی مامۆستایەتییەکەی کاری دادوەریشی دەکرد، پێگەیەکی تایبەتی هەبوو لای دەسەڵاتدارانی مەمالیك ڕێزێکی تایبەتیان بۆ دادەنا، لە خودی سوڵتانیش زۆر نزیك بوو، لەگەڵ ئەوەشدا مەلا گۆرانی دەستی کردووە بە خۆ نزیککردنەوە لە دەسەڵاتدارانی شاری قاهیرە، بەهۆی ئەوەی مەلا گۆرانی لەو تەمەنە گەنجیەی خۆی زیرەکیی و لێهاتوویی زۆر سەرنجی ئبین حجر رادەکێشێت، بە تایبەتی شێوازی قسەکردن و خوێندنەوەی زمانی عەرەبی و دەربڕینی وشەکان زۆر بەڕەوانی، بۆیە لەگەڵ خۆی دەیبات بۆ کۆڕی دەسەڵاتدارانی کۆشك، کە لەو کۆڕە بە ئامادەبوونی سوڵتان و وەزیرەکان و زانا بەناوبەنگەکانی شارەکە، بە خوێندنەوەی سەحیحی بوخاری بە کۆمەڵ گوێیان بۆ فەرموودەکانی پێغەمبەر دەگرت[1]، مەلا گۆرانیش ئەم دیدارانەی سوڵتان و وەزیرەکان بە هەل دەزانێ و پەیوەندیان لەگەڵ دروست دەکات. یەکەم پەیوەندی ڕاستەوخۆی گۆرانی لە دوای مامۆستاکەی ئیبن و حەجر لەگەڵ دادوەرێکی بە ناوبانگ بەناوی کەمالەدین محەمەد ئیبن بارزی بوو. کە پێشتر لە ریزی سوپای مەمالیك و ماوەیەکیش کاری دادوەری کردوە لە شام، بەڵام بەهۆی لێهاتوویی کمال دین، پاشا بۆلای خۆی بانگی دەکات و سەرەڕای پێدانی پیشە کۆنەکەی، دەیکاتە ڕازنوس (خامەی نهێنی) و چاودێری گشتی و زۆر لە خۆی نزیك دەکاتەوە[2].

---

[1] شوکانی ، ص ٤٥ . البقاعي ، ص ٦١.

[2] المقريزى ، ص ٣٠١.

ناسینی کەماله دین  بۆ مەلای گۆرانی، واتـه ناسـینی کەسـی دووەمـی وڵات، بەمەش  مەلا گۆرانی دەتوانێ پایەکیتر لـه پەیـژەکانی گەیـشتن بـه سـولْتان ببڕێـت، بـەهۆی کەمالـه دینـەوە دەتـوانێ دەسـتی بگاتـه هەستیارترین جومگـەی وڵات،ناسـینی کمـال دیـن بـۆ مـەلا گـۆرانی تـەنها بایەخی سیاسی نەبوو، بەڵکوو له رووی مادیشەوە گەنجینـەکی بـاش بـوو بۆ مەلا  گۆرانی،  کەماله دین ماڵ و سامانێکی زۆری پێ بەخشی، ئەمەش یەکەمجار بوو گۆرانی له تەمـەنی خـۆی ببێتـه خـاوەنی مـاڵ و سـامانێکی وەها زۆر، له راستیدا مەلا گـۆرانی تـا ئـەو کـاتیش بگـرە دواتـریش،  هـیچ کـات پـشتی بـەهێزو بـازوو نەدەبەسـت بـۆ کۆکردنـەوەی مـاڵ و سـامان، بەڵکوو تەنها وێڵی فێربوونی زانیاری زیاتری دەکرد، وەك سەخاوی دەڵێت گۆرانی به درێژایی ژیانی له ناوچەکانی خۆی و شام و قـودس و میـسر بـه هەژاری کوڵەمەرگییەکی زۆر سەخت ژیاوە،  هیچ هاوکار و کۆمەکییەکی له بنەماڵه و خێزانەکەی بۆ نەهاتووە،  ئەم هەژارییه هیچ کاریگەری له نەفس بەرزی مەلا گۆرانی نەکردووە،  تا هاوکاری له دەوروبەری وەربگرێت [1].

مـەلا گـۆرانی ئـەو مـاوەی  قـاهیرە بـوو، مـاوەی فـەرمانڕەوایی سـێ دەسەڵاتی مەمالیکەکانی بینی،  کـه ئـەویش هەریەکـه لەمـەلیك (برسـبای (٨٢٥–٨٤١ و ســـەردەمی (ئەبولمحاســـین (٨٤١–٨٤٢ ك) و چـــەقماق (٨٤٢–٨٥٧ ك ). هەر یەکه لـەم فەرمانڕەوایانـەی مـەمالیك تەیبەتمەنـدی خۆیان هەبوو، وەکو گوتمان سەردەمی برسبای به سـەردەمی تەنگـەژەی ئابوری و فراوانخوازی دادەنرێـت، برسـبای هەرچـەندە پیـاوێکی ئەوەنـدە

[1] هەمان سەرچاوە ، ص ٣٦٤

زانست پەروەر نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگری لە زانایان نەدەکرد. هەرچی پەیوەندی بە دووەمین فەرمانڕەوای مەمالیکەوە هەیە، ئەوە بەهۆی تەمەنی هەرزەکارانەی ئەم، کە ئەوکات تەمنی چوارده ساڵ و چەند مانگێك بوو،منداڵێکی کەم ئەزموون بوو، توانای بەرێوەبردنی وڵاتی نەبوو، دوای ساڵێك تێپەربوونی ماوەی حوکمڕانیەکەی لە لایەن سوڵتان چەقماقەوە کودەتای کرایە سەر و لەسەر تەختی فەرمانڕەوای هێنرایە خوارەوە.[١]

ئەم ئاڵۆزەییە سیاسییە دەرفەتێکی باشی ڕەخساند بۆ مەلا گۆرانی، سوڵتان چەقماق پیاوێکی خواپەرست و زانستپەرەوەر بوو، هەمیشە حەزی بە کۆڕی زانایان دەکرد، وڵات لە سەردەمی ئەمدا لە بواری زانست و زانیارییەوە پێشکەوت،بە تەواوی پاڵپشتی قوتابخانە ئاینەکان دەکر، کەشێکی وای ڕەخساند، کە کۆمەلێك زانای بەناوبانگی ئیسلام لەو سەردەمە دورستکوڕی، وەکو ئیبن حەجەرو زرکانی و شێروانی و قلقەشەندی... هتد.

لەڕووی سیاسییەوە توانی ئاشتەوایی لەگەڵ دەولەتی عوسمان و هۆزە تورکمانەکان ڕابگەینێ، کۆتایی بە هێرش و ئابلوقە سەربازییەکان بهێنێ، چاکسازییەکانی لە بواری ئابووری و کارگێری پێش بخات.[٢]

گۆرانی لەم ماوەیە، واتە لە سەردەمی حوکمڕانی ئەبولمحاسین ( (٨٤١–٨٤٢ ك دەستدەکات بە ووتنەوەی وانە ئایینی لە فێرگەی

---

[1] توقوش ، لا ٣٩٢–٣٩٣

[2] السير وليام ، ص ١٥٥–١٥٨

بێرکۆکیه که یەکێك بووه له فێرگه گەورەکانی قاهیرە،زانایانی هـەر چـوار مەزهەبەکـەی تیـادا دامـەزراوه، مـەلا گـۆرانیش بـەهۆی سـیفەتی شـافعی بـوونی بـە هـەوڵی کمـال دینـەوه کـه تـوانی وەك و مامۆسـتا لـەو فێرگـه دایمـەزرینێ، بـەڵام ئـەم ماوەیـه چـەندی خایانـدوەو لـە دەسـتپێکردن و کۆتایهێنانی، لەبارەی قوتابیاکانی و کامه دەرسی گوتبێتەوه هیچ کام لەم زانیاریانه بەدەست نین، ئەم ماوەیـه تـەنها خـەریکی گفتوگۆکـانی نێـوان مەزهەبەکان بووه.

مەلا گۆرانی به ناسینی ئیبن حەجەر و کەمالەدین توانی دوو دەروازەی گرنگ بکاتەوه، تا بتوانێ بەو هۆیەوە تێکەڵ به کاری سیاسی و کارگێریی دەوڵەت ببێت، بەڵام پێویستی به سێیەم دەروازەش هـەبوو، کـه ئـەویش ناسینی دادوەرێکی تر بوو بەناوی زەینەدین عەبدولباسـت، ناسـینی ئـەم داد وەره بـۆ مـەلا گـۆرانی هیـچی لـه دوو هـاوریێ و مامۆسـتاکەی تـری کەمتر نەبوو، بۆیه ئێستا کاتی ئەوه هـاتووه بگـات بـه سـوڵتانی مـەمالیك زاهیر چەقماق، بۆ ئەم مەبەسته بەردەوام له لەگەل ئیبن حەجەر بەشداری کۆڕی خوێندنەوەی فەرمودەی دەکرد، تـا تـوانی بـەو هۆیـەوه زیرەکـی و لێهـاتووی خـۆی بـۆ سـوڵتان بـسەلمینێ،ئیبن حەجـەر خـۆی وێنـەی ئـەو ساتانەمان بۆ دەکات که مەلا گۆرانی تیایدا له سوڵتان نزیك بۆتـەوەوەك دەڵێت، مەلا گۆرانی نەك هەر بۆ خوێندنـەوەی فـەرمودەکانی بوخـاری لـه کۆڕی سوڵتان بەشـداری دەکـرد، بـەڵکو هـەموو ڕۆژێـك لـه بەیانییـەوه تـا وەکو نیوەڕۆ له مەجلسی چەقماق ئامـاده بـوو، گـۆرانی ئـەم دیدەنییـەی سوڵتانی بەهەلزانی، هەموو رۆژێکـیش بـەبێ دواکـەوتن ئامـاده بـوو، لـەو

ساتانەی لەگەڵ سولتاندا بەسەری دەبرد، زۆر بە وریاییەوە مامەڵەی دەکرد، هەوڵی دەدا سەرنجی سوڵتان بە تەواوی بۆ لای خۆی رابکێشێت، هەر واش دەرچوو، بۆ یە کەسایەتی مەلا گۆرانی لای سوڵتان جیگای بایەخ بوو، ئەمەش وای کرد بە پێش چاوی خەڵکی دا پلە و پایەی گەورەتر بێت،[1] گفتوگۆکانی سەرنجی سوڵتانی راکێشا و بە ماوەکی کەم توانی ببێتە ئاشناترین کەس چەقماق، بەمەش لە کۆشك لای خۆی وەکو پیاوی دەوڵەت دایمەزراند، کە جیگای خۆیەتی لێرە رۆڵی کەمالەدین نادیدە نەگرین لە تەزکیەکردن و نزیکردنەوەی مەلا گۆرانی لە سوڵتان، کە ئەمەش دووەم چاکەیەتی لە بەرامبەر مەلا گۆرانی[2].

## ١. ١٠: مەلا گۆرانی و ڕووبەڕووبونەوەی یەکەم کێشەی سیاسی و مەزهەبی (کێشەکەیی لەگەڵ حەمیدەدین):

دوای نزیکبوونەوەی مەلا گۆرانی لە سوڵتان و بەدەستهێنانی ڕەزامەندی سوڵتان بە مانەو، و دامەزراندنی لە کۆشك، ئیتر مەلا گۆرانی هەر بەتەنها وەکو قوتابیەکی زانست نەمایەوە، بەڵکو ئێستا گۆرانی پیاوی دەوڵەتە و پێگەیەکی تایبەتی لە کۆشکدا هەیە، کە ئەوکاتە تەمەنی گۆرانی لە نێوان ٣٠ بۆ ٣١ساڵ دەبوو، هاتنی گەنجێکی بێگانە لە دوورە وولآتێکەوە و لە ناوچەیەکی ژێر چەپۆکی دوژمنی مەمالیکەکان و جێگربوونی لە ماوەیەکی کەم و وەرگرتنی پلەو پایە لە کۆشك بۆ

---

[1] ابن الاحجر ، ص ١٥٩ ، المقريزي : السلوك لمعرفة دول الملوك ، المحقق: محمد عبد القادر عطا 1997 ، مجلد ٧ ، ص ٤٦٥

[2] Yıldz; s 32

پایەدارەکانی دەوڵەت، هەر وا ئاسان نەبوو،مەلا گۆرانی تا ئەو کات پیاوێکی بە مەزهەب شافیعی بوو، لە هەمان کاتدا دەوڵەتی مەمالیك لەسەر رێرەوی ئیمامی حەنەفی بوو، وە مەرجەعە ئاینیەکانی دەوڵەتی مەمالیك تێکەڵەیەکی هەر چوار مەزهەب بوو، بۆیە بەشێك لە نوێنەرە حەنەفییەکان کەوتنە پیلان گێری لە دژی، ئەویش دورستکردنی تۆمەتێك بوو لەگەڵ یەکێك لە قازیەکان بەناوی حەمیدەدین نوعمانی، ئەم پیاوە ناوی محەمەد کوڕی ئەحمەدی کوری محەمەد حەمیدەدین بە ڕەچەڵەك خەڵکی شاری بەغدا بوو، کە بانگەوازی ئەوەی دەکرد لە نەوەی ئیمام ئەبو حەنیفەیە و بە حەمیدە دین ناسرا بوو، زانستەکانی ڕستەسازی،وشەسازی، واتاسازی، بەیان و ئسوول لە ناوچەکانی خۆی و دیمەشق تەواو کردبوو، هەر لەوێش ماوەیەك کاری دادوەری کردبوو، دوای هاتبووە قاهیرە، ڕووداوێك ڕوودەدات کە بە زیانی حەمیدەدین تەواو دەبێت و ئەویش ئۆباڵی ئەو کرا دەخاتە ئەستۆی مەلا گۆرانی و بۆیە لە نێوانیاندا دەمە قاڵێ دورست دەبێت، لە ئەنجامدا حەمیدەدین شکایەت لە مەلا گۆرانی دەکات بە تۆمەتی ئەوەی کە گوایە جنێوی بە ئیمامی حەنەفی داوە و شوهرەتی خستۆتە ژێر پرسیارەوە، رووداوەکە لە نێو پەرتوکەکانی هەموو مێژوونووسەکانی ئەو سەردەم تۆمارکراوە، کە هەندێك لە نووسەری ئەم پەرتوکانە هاوڕێ و مامۆستای گۆرانی خۆی بوون، ڕوداوەکە دەنگدانەویەکی گەورەی دورستکرد، یاخود بە جۆرێك بڵێن گەورە کرا، هەر یەکە لە ئیبن و حەجەری مامۆستای و ئیمامی

مەقریزی و سەخاوی و شەوكانی  و بیقـاعی  و تـەغریی بـەردی، پوختـەی ڕووداوەكە بە هەندێ گێرانەوەی جیاواز بە  دەگێڕنەوە:

* ئیبن حەجەری مامۆسـتای كـە خـۆی  نـەك هـەر شـاهێدی ڕووداوەكـان بووە،  بەڵكوو ڕۆڵی دادوەر و  یەكلایكردنەوەشی لـەو سـەردەمە بینیـوە، لە هەموویان وردتر باسی چـۆنیەتی سـەرهەڵدانی كێـشەكە دەكـات،  بـەم شێوە باسی روداوەكە دەكات،دوای ئەوەی یەكێك لە ڕازنووسەكان (كاتـب سر ) بە ناوی حەمیـدەدین كـوڕی تـاج  نوعمانی،كـە پێـشتر خوێنـدنی لـە دیمەشق تەواو كردووە، حەزی  بەوە دەكرد كە هـەر لـە دیمەشـق وەزیفـە وەربگرێت، ئەو كات لە قاهیرە دادەنیشت، بۆیە توانی ڕەزامەندی سوڵتان بەدەست بهێنێ و سوڵتان فەرمانی دامەزراندنی بۆ بووسێ، لەو كاتەی كـە حەمیـدەدین ویـستی بـەرەو دیمەشـق بەڕێبكـەوێت، قازییـەك بـەناوی شەمسەددین سەفدی هاتە ڕێگایی و وەكو دیارە ڕێگری كـردوە، لـەوەی كە حەمیدەدین بچێتە دیمەشق و ڕەنگە ئەمەش هەر بە فـەرمانی سـوڵتان ببێت، بۆیە حەمیدەدین بە توڕەی دەگەڕێتەوە بۆ لای سوڵتان: دەڵێت كە نـەوەكانی ئیمـامی ئـەبو حەنیفـە لـە پێـشترن بـۆ هـەر شـتێك، چـونكە حەمیدەدین خۆیی بە نەوەی ئیمامی ئەبو حەنیفە دانا بوو، ئـیبن حەجـەر پـێش ئـەوەی بـچێتە سـەر پوختـەی بابەتەكـە، ڕاسـتەوخۆ بڕیـارێكی پێشوەختە دەدات، دەڵێت ئەم چیرۆكە چیرۆكێكی هەڵبستراوە، بەڵام ئەم پەشیمانبوونەوەی سوڵتان لە پێدانی پۆسـت و پایـە بـە حەمـددین، مـەلا گۆرانی بە هۆكار دەزانرێت، بۆیە مەلا گۆرانیش ئینكـاری ئـەم بۆچـوونەی حەمیدەدەین دەكات،  كێشەكە لە نێوانیان گەورە  دەبێت، بڕیـار دەدەن

کێشەکە ببەنە لای دادوەرێکی رازنووس (کتاب سر) هەر دوولا لەبەردەم قازی ئامادە دەبن، لە کاتی قسەکردندا پێدەچێ حەمیدەدین زۆر هەڵچووبێت و دەکەوێتە قسە گوتن بە مەلا گۆرانی و تا ئەو ڕادەیەی پێی دەڵێت (تۆ کەری و تێناگەیت)! گوایە مەلا گۆرانیش وا وەڵامی حەمیدەدینی داوەتەوە (کەر تۆیت و باوك و باپیریشتە ). کەسێك لەو دانیشتنە بە ناوی بەدرەدین مەحمود کوڕی عوبێدللا ا ئامادە بوو، کە ئەمیش پێشتر لە کاری دادوەری لە دیمەشق لای قازیەك بەناوی یەنال جەمکی کاری کردبوو. بۆیە حەمیدەدین ئەم جوێنەی مەلا گۆرانی دەکاتە بە هانەو کە چۆن دەبێت گەنجێکی شافیعی مەزهەب جنێو بە ئیمامی ئەبوو حەنیفە بدات، جنێودان بە ئەبوو حەنیفە واتە جنێودانە بە ئالو بیت.

بۆیە بەبێ وەستان حەمیدەدین سکاڵا لە لای خودی سوڵتان تۆمار دەکات و لەگەڵ خۆشی بەدرەدین مەحمود وەکو شاهید دەبات و ئەمیش لە بەردەم سوڵتان تەواوی چیرۆکەکە دەگێڕێتەوە گوایە مەلا گۆرانی وای بە ئیمام ئەبو حەنیفە گوتووە [١].

ئیبن حەجەر زوو هەستی بەوە کردبوو، کە ئەو پرۆپاگەندەی حەمیدەدین دەیکات گوایە لە نەوەی ئیمام حەنیفەیە راست نییە، دەڵێت هەر کەسێ کەمترین زانیاری لە بارەی هەواڵی پێشینان هەبێت دەزانێ کە حەمیدەدین درۆ دەکات و لە هەمان کاتیشدا مەلا گۆرانی باش دەناسێ و دەیزانێ ئەو قوتابیەی لە لووتکەی رەوشت دایە،بەمەش سەرسامیی

[1] ابن الحجر ، ص ١٥٩

خۆی بەو قسانەی حەمیدە دین و بەدرەدین دەردەبڕێت، سولْتانیش وەکو پێویست مەلا گۆرانی ناسی بوو، دەیزانیٚ کە گەنجێکی جنێو فرۆش نییە هەر بۆیە نامەیەك بۆ تەقێدین مەقریزی نووسیوە، دوای شاهیدێکی تری لە حەمیدەدین کردووە، کە بەگوێرەی شەریعەتی ئیسلام بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەم بابەتە، دەبێت بەلانی کەم دوو شاهید ئامادە بێت، بەڵام شاهێدی دووەم ئامادە نەبووە. بۆیە سیناریۆی بوهتانەکە شکست دەهێنێت، مەلای گۆرانیش وەکو عادەتی هەمیشەیی، کەسایەتی بەرز دەبێتەوە،لەگەڵ ئەوەشدا حەمیدەدین تا مەلا گۆرانی بە سزا نەگەینیٚ، دڵی ئاو ناخواتەوە، بوونی گەنجێکی وەك ئەو لەپاڵ سولْتان چەقماق بۆیی قورسبوو، بۆیە هەر وا بە ئاسانی ناکرێت کۆڵ بدات، دوای ئەم وەڵامەی سولْتان لەگەل قازیە حەنەفیەکان کۆدەبێتەوە و قسەیان لەگەڵ دەکات، ئیبن حەجەر دەڵێت:حەمیدەدین زیادەڕەوی کردووە لە بەرگریکردن لە خۆی و لە ناو قازییە حەنەفییەکان دووپاتی کردەوە و گوتی:ئەو پیاوە مەبەستی مەلا گۆرانی بوو جنێوی بە ئیمامی حەنەفی داوە، چونکە باپیری منە و گۆرانیش دەزانیٚ من کوڕی کێم.

بەڵام حەمیدەدین کۆڵی نەدا، سوور بوو لەسەر ئەوەی دەبێت گۆرانی بە سزا بگەیەنیٚ، بۆ ئەم مەبەستە جارێکی تر داوای مۆڵەتی سولْتانی کرد، ئەم جارە پەنای بۆ فێڵێکی سیاسی بردووە، گوتی ئەی سولْتانم (ئەبو حەنیفە دەرگایە )، واتە مەبەستی ئەوە بوو مەزهەبی سەرەکی دەوڵەتی مەمالیکە، جگە لە ئەو کەسیتر نییە. گۆرانی دەمارگیری هەیە و لە کاتێك تۆ میواندارییت کردووە، و ئەگەر هەواڵی ئەم جنێوە بگاتەوە

دەوڵـەتی عوسمـانیی، کـە ئـەوانیش حەنـەفی مەزهـەبن، لـە کاتێکـدا لێپێچینەوە نەکەیت ئەوا کارەکە خراپتر دەبێت، بەمەش تـوانی بـەو فێڵـە سحراوییەی سوڵتان فریو بدات، راستەوخۆ فەرمانیدا بە زیندانیکردنی مەلا گۆرانی لە بورج، هەموو پلەوپایەکی لێسەنراوە، و ڕۆژی دادگاییکردنی بۆ دیاری کرا، کە بریتی بوو لە ڕۆژی هەینی جەمادی دووەم ساڵی ٨٤٤ ك لە یەکەم ڕۆژی دانیشتنی دادگـا بـە ئامـادەبوونی مـەلا گـۆرانی و قـازی حەنەفی بۆ لێپرسینەوە لە گۆرانی، بەڵام سوڵتان هەر سـوور بـوو لەسـەر شاهیدی دووەم، بۆیە حەمیدەین، کەسێکی تری هێنا، بە ناوی بـەدرەدین کوڕی مەحمود کوڕی حوسێن و کردیە شاهێدی دووەم، ئبن حەجەر ئـەم پیـاوەی بـاش دەناسـی، بۆیـە لـە وەسـفی ئەمـدا دەڵێـت: ئـەو شـاهێدە شاهێدی درۆیە (الزور ) ئەم پیاوەش هەر لە دیمەشق هـاتبوو بـۆ قـاهیرە، خاڵی بە ناوی بەدرەدین کوڕی ئەمانە کە قازی بوو لە دەوڵـەتی مـەمالیك، بە فڕ و فێڵ و بەرتیل پلە و پایەی پێدا بوو،مەلا گـۆرانی بـەهۆی سـیفەتە خراپەکانی زۆر رقی لێبوو، هەموو خەڵکی قاهیرە دەیانزانی کـە پیـاوێکی درۆزنــە، بۆیــە کاتێــك لەبــەردەم دادوەر ئامــادە بــوو، شــاهیدی لێــوەر نەدەگیرا، ناچار دادگایی کردنەکەی مەلا گۆرانی بۆ رۆژی شەممە دواخـرا، بەڵام لە ڕۆژی شەممە پیـاوێکی دکتـۆر بـە نـاوی شەمـسەدینکوڕیعەفیف شاهێدی تەنها شاهێدی ئەوەیدا کە بیستوویەتی گۆرانی جنێوی بـە ئیمـام حەنەفی داوە،[1] کەمالەدین جارێکیتر دەکەوێتە شەفاعەتکردن بـۆ مـەلا گۆرانی لای سوڵتان بەمەش دەتوانێ گەردنی گـۆرانی لـە شمـشێر رزگـار

---

[1] ابن الحجر ، ص، ١٦٠

بکات، چونکە ئەگەر ئەم تۆمەتی جنێوەی لەسەر ساغ ببوایەوە، ئەوا بێ گومان سزاکەی مردن دەبوو، سەرئەنجام سوڵتان فەرمان دەکات بە سزادانی مەلا گۆرانی کە بریتی بوو لە لێدانی (٧٥ ) قامچی لەژێر پێیەکانی بە رووتی، ڕاگرتنی لەناو خۆڵ[1] .

٢. سەبارەت بە سەخاویش ئەوا لە ڕاستیدا زۆر خۆش نودە نەبووە بە کەسایەتی مەلا گۆرانی، لە یەك لاپەڕەی پەرتووکەکەی سێ گومانی خراپ بە مەلا گۆرانی دەبات، بەر لەوەی ئێمە گومان بەو گومانە خراپانەی سەخاوی ببەین، ئەوا شەوکانی بەرپەچی داوەتەوە،[2] کە گومانەکان ئەمانەن:

* کاتێك باسی وەرگرتنی پلەوپایەی مەلا گۆرانی دەکات لە قاهیرە، دەڵێت گۆرانی دوای وەرگرتنی پلەوپایە و ماڵ وسامان، هەوەسی بۆ ژنان زۆر بووە، هەر بەدوای یەکتر ژنی هێناوە و لێیان جیابۆتەوە[3] !.

* لە رووداوەکەی لەگەڵ حەمیدەدین، کاتێك تەواوی باسەکە دەگێڕێتەوە، لە کۆتاییدا پەلارێك دەگرێتە مەلا گۆرانی و بە ئایەتی (ولا یظلم ربك أحدا ) کۆتایی بە بابەتەکە دێنێ، وەکو ئەوەی مەلا گۆرانی ستەمی بەرانبەر حەمیدەدین کردبێت.

* کاتێك نێوانی مەلا گۆرانی و محەمەد فاتیح تێکدەچێ، ئەو کاتەی مەلا گۆرانی لە حەج دەبێت، داوا لە بیقاعی دەکات بەرهەمی شەرحی (جمع الجومع ) لە ئەنادۆڵ بڵاو بکاتەوە، سەخاویش وەکو پەلارێك وەڵامی ئەم

---

[1] ابن الحجر ، ص ١٥٨

[2] شوکانی ، ص ٤١

[3] السخاوی ، ص ٢٤١–٢٤٢

داوایە مەلا گۆرانی بە ئایەتی (وَمَنْ لَمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُوراً فَمَا لَهُ مِنْ نُورٍ ) دەداتەوە.[1]

سەخاوی ڕووداوەکەی زۆر بە کورتی باسکردووە، نزیکە لە گێڕانەوەکانی ئیبن حەجەر، بەڵام تەنها لەو خاڵەیان جیاوازە، کە مەلا گۆرانی بە ئامادەبوونی سوڵتان و بە دادگایی کردنی لەلایەن قازییەکی حەنەفی ناوی ئیبن دەری، بڕیار دەدرێت بە لێدانی (٨٠) قامچی و دوورخستنەوەی لە ئەرکی مامۆستایەتی لە قوتابخانەی (بێرکۆکییە) و دانانی جلال محی لە شوێنی و فرۆشتنی ماڵەکەی و دوورخستنەوەی گۆرانی بۆ شام [2].

٣- ئیمام مەقریزی ئەویش ساڵێك دوای ڕووداوەکە کۆچی دوایی دەکات واتە ٨٤٥ ك، لە دوو پەرتووکی خۆی بە کورتی ڕووداوەکە وا دەگێڕێتەوە، کە دوایی هەواڵ گەیشت بە سوڵتان کە مەلا گۆرانی لە مەجلیسێك جنێوی داوە بە ئیمام حەنەفی،ئەمەش دوای ئەوەی کە شەیتان دەکەوێتە نێوان حەمیدە دەین و مەلا گۆرانی تا ئەو رادەی گۆرانی جنێو دەدات بە حەمیدەدەین و بە خۆی و باو باپیری گوتووە کەر، لەسەر ئەوە حەمیدەدین سکاڵا لای سوڵتان دەکات لە گۆرانی، = سوڵتانیش داوای حوکمی دادگا دەکات، مەقریزی جیاواز لە ئیبن حەجەر و بیقاعی ناوی دادوەرێکیتری هێناوە بە ناوی سەعدەدین ئەیوبی، کە کاری دادگایی کردنەکەی مەلا گۆرانی بەڕێوە بردووە، هەر بۆ ئەم

---

[1] سخاوی ،ص ٢٤٢-٢٤١.

[2] سخاوی ، ص ٢٤٢.

مەبەستە دادگا پێك دەهێنرێت و بە ئامادەبوونی دادوەر و سولّتان و سكالاكار و تۆمەتبار و هەندێ لە پیاوانی ناودار و قوتابیانی زانست، سەرەتا دادوەر بڕیار دەدات بە بەندكردنی گۆرانی بەشێوەیەكی كاتی لە زیندانی مزگەوتی موئەیەدی و تا رۆژی دادگای كردنەكەی. وە لە رۆژی دیاریكراو، بڕیار دەدرێت بە لێدانی قامچی لەژێر پێیەكانی مەلا گۆرانی و فرۆشتنی مالّ و سامانەكەی، دەركردنی لە پیشەكەی و دەستبەركردنی لە مالّەكەی خۆی كە بۆی نەبوو بێتە دەرەوە. تا دواتر دەنێردرێتە دیمەشق[1] .

٤- تەغرربەردی ٨١٣- ٨٧٤ ك:یەكێكی ترە لەو مێژوونووسانەی باسی ڕووداوەكە دەكات بەم شێوەیە:

له ڕۆژی شەممەی جمادی الاخر (٨٤٤) كۆچی، دەمەقالێ دەكەوێتە نێوان قازیی حەمیدەدین حەنەفی و شەهابەدین گۆرانی شافعی، تا فەرمان دەدرێت بە راگرتنی هەردوو لا لە بەردەم سولّتان، سەر ئەنجام سولّتان لە حەمیدە دین تووڕە دەبێت، داركاری و ئیهانەی مەلا گۆرانیش دەكات، فەرمان دەكات بە دوورخستنەوەی بۆ دیمەشق و پاشان بۆ ناوچەی رۆژهەلات، بە ناشیرینترین شێواز. ئەمە ئەو مەلا گۆرانییە كە لە سالانی (٨٤٠ ك)هاتۆتە قاهیرە و كەسێكی هەژار و بێ دەرەتان بووە، تا ئەو كاتەی پەیوەندی دەكات بە قازیی كەمال بارزی، ئەویش بەهۆی ئەوەی پیاوێكی باش بووە و وەكو نەریتی خۆی یارمەتی ئەهلی زانستی داوە، بۆیە مالّ و سامانێكی زۆری بەخشییە مەلا گۆرانی و بە خەلّكی ناساند،

---

[1] المقریزی ، ص ٣٦٤-٣٦٥ ، السلوك لمعرفة دول الملوك ، ٤٦٥

لەگەڵ خـۆی بردۆتییـە نـاو کـۆڕی دەسـەڵاتداران، بـەڵام گـۆرانی بـەهۆی ئەوەی نەیتوانی زمانی خۆی بپارێزێ، چونکە پیاوێکی نەفام بـوو، بۆیـە ئەم ڕووداوەی بەسەر خۆی هێنا [١].

لەراسـتیدا ئـەم وێنایـەی تـەغری بـەردی بـۆ گـۆرانی مایـەی هەڵوێەستەکردنە، چونکە سەرەڕای ئەوەی خۆی لەو سـەردەمە و هـەر لـە قاهیرە ژیاوە، بەڵام زانیاریەکانی زۆر کەم و سەرەتاین، چونکە پێ ناچێ نـەك خـۆی ئامـادەی ڕووداوەکـە بووبێـت، بـەڵکو ئاگـاداری نـاوەڕۆکی کێشەکەش بێت،بەڵکو کەوتۆتە ژێر پڕوپاگەنـدەی حەنـەفی مەزهەبـەکان، کـە دژ بـە مـەلا گـۆرانی بڵاویـان کـردەوە، هـەتا تـەغریری بـەردی لـە پەرتوکەکەی خۆی (**المنهل الصافی والمستوفی بعد الوافی** )، کە لـە ١٣ بـەرگ پێکهـاتووە، باسـی زیـاد لـە ٢٨٢٨ زانـا، مێـژوونووس و فەقیـە، مەلیکەکانی ناوچەی ڕۆم، شام، قاهیرە، قودس و حیجاز دەکات، بەڵام بە هیچ شێوەیەك باس لە سایەتی مـەلا گـۆرانی ناکات،لـە کاتێکـدا مـەلا گۆرانی لە رۆژگاری ئەم موفتی دەوڵەتی عوسمانی بووە و لە کاتی فەتحی قوستەنتینیەش بە دەستی خۆی نامـەی سـەرکەوتنی بـۆ مـەمالکی میـسر نووسـیوە، کاتێـك نامەکـەی دەگاتـە قـاهیرە، تـەغری بـەردی خـۆی لـەو کۆرەی سولّتان ئامادە دەبێت، ئەمەش رەنگە بۆ ئەو هۆکارە بگەرێتـەوە کە تەغریری بـەردی لـە بنەماڵەیـەکی زەنگـین و دەسـەڵاتدار بـوو، بـاوکی وەزیری دەوڵەت بوو، تغریری بەردی مانای ناوەکەی بە خۆیەوە بەند بـوو

---

[1] تغري بردي : النجوم الزاهرة فى ملوك مصر والقاهرة ، وزارة الثقافة – مصر ، ص ١٠٥–١٠٦

(خوداپێداو ) بە زمانی تورکی، هەردەم لە دەرباری سوڵتاندا بوو، زۆربەی کاتەکانی لە وێنە کێشان و مۆسیقا و ئەسپ سواری و گەران بەسەر دەبرد،[1] بۆیە زانیاریەکانی لە بارەی مەلا گۆرانی زۆر کرچ و کاڵن، تەنها دەڵێ دەمەقاڵێ لە نێوانیان ڕوویداوە،چونکە ئەمە سەرەڕای ناونیشانی پەرتووکەکەی، کە بە تەواوی تەرخانی کردووە بۆ ڕووداوەکانی سەردەمی زاهیر چەقماق و زانا و ناودارانی ئەو کاتی میسر، بەڵام بە تەنها یەك دێریش جگە لەو چەند پەرەگرافەی ئاماژەمان پێکرد لە هیچ شوێنێکی تر ئاماژە بە مەلا گۆرانی ناکات، سەرەڕای ئەوەی ئەو بۆچوونەی ئیبن تەغری بەردی پێچەوانەی بۆچوونی مێژوونوسەکانی ترە، ئەوەی تێبینییش دەکرێت لە شێوازی دەربرینەکەی تەغری بەردی وەکو شکاندنەوەکی کەسایەتی مەلا گۆرانی لە کاتی ناوهێنانی بەستۆتەوە بە مەزهەبی شافعی و ئەوە بیر دەخاتە کە گۆرانی کاتێك دێتە میسر جگە لە پیاوێکی هەژار و نەدار هیچی تر نەبووە، ئەوە کەمال بارزی بووە گۆرانی کردووە بە هەموو شت،گۆرانی زمان درێژی خۆی گەیاندویەتی بەو ڕۆژە.

٥- شەوکانیش دوای وەرگرتنی ڕووداوەکانی لە سەخاوی،ئینجا بۆچوونی خۆی دەربارەی ڕووداوەکە دەخاتە روو و دەڵێت:لە لوتفی خودا بووە قازییەکی حەنەفی مەزهەب حوکمی بەسەر مەلا گۆرانیی داوە، چونکە ئەگەر قازییەکی مالیکی مەزهەب حوکمی بکردایە، ئەوە سزاکەی بریتی دەبوو لە سەرپەڕاندن لە ملیڕا. لەلای خودا زۆر ناشیرینە ئاوا بەو

[1] https://ar.wikipedia.org/wikiابن_تغری

ئاسانییه خوێن و نامووسی خەڵك حەڵاڵ بكرێت، كه خودا داوای نەكردووە بەو جۆرە شتانه خوێن برێـژرێت، ئـەو سـزایەی ئـەو زانـا گەورەیـه ٨٠ جەڵـدی لێـدرا و دووریـش خرایـەوە، ئـەوە زوڵمێكـی گـەورە و مـاف خواردنێكی دیار بوو، به تایبەت ئەو ئەو جنێوەی دابوو بەو كەسـە، مـەلا گۆرانی نـەیزانیوه ئـەم پیـاوە لـه نـەوەی ئیمـام ئـەبوو حەنیفەیـە، خـوای گەورە له دەسەڵاتەكانی باشترین دەسـەڵاتی پـێ بەخـشی، لـه پـارێزراوی باشترین پارێزراوی پێدا، ئەوان كاتێك رۆزیان بڕی، خوای گـەورە باشـترین رۆزی پێدایەوە، ئەوانەی بەخیلییان پێ دەبـرد خـوای گـەورە بـەرزتر لـەو پلەی پێدایەوە [١].

## ١. ١١:قۆناغی دەربەدەری و ئاوارەیی:

خۆشگوزەرانی و پلەوپایەی مەلا گۆرانی ماوەیەكی كـەمی خایانـد و بەردەوام نەبوو، ڕووداوەكەی قاهیرە تاقیكردنەوەیەكی سەخت بوو، بۆ گەنجێكی كەم ئەزموونی وەكو مەلا گـۆرانی،دوای بڕیـاری دادگـا، مـەلا گۆرانی گەڕایەوە سەر ژیانی، پێنج ساڵ لەمەو پێش، ئـیتر ئێـستا لـه پیـاوی كۆشـك، بۆتـه دیلێكـی دەستبەسـەركراو، مـاڵ و سـامانەكەی دەستی بەسەرداگیراوە هیچی بۆ نەمایـەوە، ئێـستا گـۆرانی لـه جیـاتی بەخـشین، دەبێتـه كەسـێكی هـەژار، ئـەم ڕووداوە كاریگەرییـەكی زۆر قووڵی له دەروونی دروستكرد، به تایبەت دوای دوورخستنەوەی بۆ شام و دەستبەسەركردنی، بۆیه مـەلا گـۆرانی نەیدەویـست ئـەم باردۆخـەی

---

[1] شەوكانی ، ص ٤٠–٤١

هەروا بەردەوام بێت، هەموو ڕێگایەکی گرتەبەر، بۆ خۆ رزگارکردن لـەو بارەی تێـی کـەوتبوو، لـەو ماوەیـەی مـەلا گـۆرانی لـە شـام نیـشتەجێ دەکرێت، بە وەرگرتنـی بۆچـوونەکەی ئـیبن حەجـەر ڕووداوەکـە لـە جەمادی دووەم ڕوویـداوە و تـا راکردنەکـەی لـە نزیکبوونـەوەی وەرزی حەجکردن نزیکەی ٥ تا ٦ مانگێك لە شام ماوەتەوە، لەم ماوەیەدا مەلا گۆرانی، زۆر هەوڵدەدات پەیوەندی بە سوڵتان بکـات، و ئەسـتۆپاکی و بێگونـاهی خـۆی بـۆ بسەلمێنێت، بـۆ ئـەم مەبەسـتە دەسـتدەکات بـە نووسینی نامە بۆی، بەڵام بێ وەڵام دەبێت، بۆیە ناتوانێ لەوە زیاتر لە شام ئۆقرە بگرێـت، سەرچـاوەکان باسـی هـیچ پەیوەندییـەك لـە نێـوان گۆرانی و کمالەدین ناکەن، رەنگە هەوڵیشی دابێت لە رێی کمالەدینەوە بتـوانێ شـتێك بکـات و بگەڕێتـەوە بـۆ میـسر، بـەڵام سـوڵتان بـە هـیچ جۆرێك لە بڕیارەکەی پاشگەز نەبوویەوە، ئەو ماوەی گۆرانی لـە شـام نیشتەجێ دەبێت، چەند مانگێکی کەم بوو، لەو ماوەیـە خـەریکی چـی بووە، روون نییە، بەڵام بێگومان بیری مەلا گۆرانی هەر لای ئەوە بووە چۆن بتوانێ دووبارە پەیوەندی بە قاهیرە بکاتەوە و بگەڕێتەوە سـەر کارەکەی پێشووی، چونکە باش لە پاکی و رێزی سوڵتان گەیشت بـوو، دەیزانی ئەگەر شاهیدی درۆی حەمیدە دیـن نەبووایـە هـەرگیز سـوڵتان خۆی لێ بێبەری نەدەکرد، بۆیە دوای بێ ئومێد بوونی لەوەی، سـوڵتان وەڵامی نامەکانی بداتەوە، یاخود نامەکانی هەر بـە سـوڵتان گەیـشتبێ، بڕیار دەدات دیمەشق بەبێ ڕەزامەندی سوڵتان جێ بهێڵێت، هـەر بـۆ ئەم مەبەستەش مەلا گۆرانی وەرزی حەج کردن بە فرسەت دەزانێـت و

بڕیار دەدات بۆ حەلـەب کـۆچ بکـات، لەگـەڵ ئەوەشـدا دەگـونجیٚ مـەلا گۆرانی نیازی چوونە حەجیشی هەبوو بێت، بـەڵام لـە شـوێنێنك بـە ناوی (تور)، کە کەوتۆتە وڵاتی ئوردن و ناوچەیەکی دێرین بووە، هـەر لەویٚ دەگیرێت،[1] هەوڵ دەدات جارێکیتر بۆ شوێنێکیتر ڕابکات، بۆیـە ئەمجارە ڕوو لە ناوچەی (اللجون )[2] دەکات، لەو کاتە گەڕان بـەردەوام دەبێت بە دوای مەلا گۆرانی، لە الجون خۆی شاردۆتەوە، پێش ئەوەی دەستگیری بکەن، بۆ شاری ناسر ڕادەکات، بەڵام لەوێش ئۆقرە ناگرێت بۆیە ئەمجارە ڕادەکات بـەرەو ناوچـەیەك لـە تـونس، بـە نـاوی عیـون، گـەڕان بـە دوای مـەلا گـۆرانی بـەردەوام دەبێـت، بۆیــە ئـەمجارە ڕوو دەکاتە سافاد، لەویٚ ماوەیەك نیشتەجیٚ دەبێـت، دواتـر بڕیــار دەدات بـچێتە شـاری تـرابلس، دوای بەجێهێـشتنی ئـەردەن، هـەر یەکـەو لـە بیقاعی و مـەقریزی دوو بۆچـوونی جیاوازیـان هەیـە لـە بـارەی دوایـن وێستگەی نیشتەجیٚ بوونی گۆرانی، مەقریزی وای بۆ ئێمە نووسیوە، کە مــەلا گــۆرانی دووبــارە قۆڵبەســتکراوە و لـــە ناوچـــەی فـــورات نیشتەجێکراوە،[3] بەڵام بیقـاعی دەڵێـت ڕووی کردۆتـە حەلـەب [4]،واتـە

---

[1] البقاعی ، ص ٦٢

[2] شارێکە لـە ئـەردەن لـە نێـوان ئـەردەن وتەربەریـە ٢٠ میـل دوورە ، لـە رملـەی فەلەسـتینیش ٤٠ میـل دوورە ، (اللجون) بەردە نوێژێکە، کەوتۆتە ناوەراستی شارەکەو کە مزگەوتی ئیبراهیم خلیلی لێیە ،لەژێر بەردەکە کانیەکی ئاو هەڵدەقووڵێت ، وەك لە سەرچاوەکان هاتووە، کە ئەو کاتەی ئیبراهیم سەلامی خوای لێبێت لـە کۆچـدا بـووە بەرەو میسر ، لەویٚ پیشێووی داوەو کە لەو سەردەم شوێنێکی وشك و چۆڵ بووە ، لەو کاتە بە گۆچانەکەی لەو شوێنەی داوەو کانیەکی ئاوی تیادا هەڵقولاوە . یاقوت حمەوی ، ج ٤ ، ص ٣٥١

[3] نفس المصدر ٣٦٥

[4] نفس المصدر ٦٢

نەگیراوە، ئەگەر بۆچوونی یەکەم کە مەقریزییە وەربگرین، ئەوە دەبێت مەلا گۆرانی سەرێکی نزیك لە ناوچەکانی زێدی باب و باپیرانیشی دابێتەوە، بۆ وەڵامدانەوەی ئەم دوو بۆچوونە، ئەوە پەیوەستە قۆناغی دووەمی ژیانی مەلا گۆرانی، دواتر ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، کە ئاخۆ مەلا گۆرانی لە کوێ مەلا یێگانی ناسی بێت؟، بەدوایین شوێنی نیشتەجێ کردنی یاخود نیشتەجێ بوونی مەلا گۆرانی پێدەخەینە ساڵی (٨٤٥) ك بەرانبەر ١٤٨٠ ز.

# ١,٢: بەشی دووەم:

## ٢. ١:کۆچکردنی مەلا گۆرانی بۆ ژێر سایەی دەوڵەتی عوسمانیی:

### ناسینی مەلا پیگان:

مەلا گۆرانی تا دواشوێن هەولّیدا بێگوناهی بۆ سولّتان بسەلمێنێت و پەیوەندی خۆی لەگەلّیدا ئاسایی بکاتەوە، نەیدەویست سولّتان هەر وا بەتەنها بەجێ بهێلّێت، دەیزانی توانای ئەوەی هەیە لە داهاتوودا خزمەت بە دەولّەتی مەمالیك بکات، بەلاّم بالّی حەمیدەدین لەناو کاری دادگا و یەکە کارگێرییەکانی دەولّەت زۆر بەهێز بوو، لە بەرانبەر ئەوەشدا گۆرانی گەنجێکی تەمەن سی سالّی بێکەس و کار بوو، تەنها کەسێ بەرگریی لێ دە کرد کەمالەدین بوو، بەلاّم ئەو بابەتەی گۆرانی پێ تاوانبار کرا بوو، بابەتێکی زۆر لەوە گەورە تر بوو کەمالەدین بتوانێ بەرگری لێ بکات، ئەوەندەی لە توانا دابوو سزاکەی سەر مەلا گۆرانی کەم بکاتەوە، بۆیە گۆرانی ئەو ماوەیەی لە فوڕات یاخود حەلەب دەبێت، هەمیشە بیر لەوە دەکاتەوە چۆن بتوانێ ژیانی لەوە باشتر بکات و بتوانێ مومارەسەی ئەو هێز و توانایەی بکات کە هەیبووە. سەرچاوەکان لەم ماوەیە هیچمان پێ

نالێن، چونکە زۆربەی مێژوونووس و زانا ئاینییەکانی ئەو سەردەمە لەناو جەرگەی پایتەختی مەمالیك کۆببوونەوە، ناوچەکانی شام و حەلەب بە بەراورد لەگەڵ قاهیرە، شوێنی کەنارگیر بوون و گرنگی ئەوتۆیان نەبوو، بێگومان ئەگەر گۆرانی ماوەیەکی زیاتر لە قاهیرە بمابووایە ئەوە مێژوونووس و زانا گەورەکانی وەکو شەوکانی، ئیبن تەغری بەردی، سەخاوی، ئیبن حەجەر، بیقاعی، تاشکۆپەری زادە، مەقریزی،سیوتی،تەمیمی داری، عەلائەدین قەلقەشەندی و زین زرکەشی وە دەیانی تر هەموو رووداو و سەروەرییە گەورەکانی مێژووی ژیانی ئەم پیاوەیان تۆمار دەکرد، سەرچاوەکان هەموویان کۆکن لەسەر ئەوەی یەکەم هۆکاری پەیوەندیکردنی مەلا گۆرانی بە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی لە رێگای کەسێکەوەیە بە ناوی مەلا یێگان، بەرلەوەی بچینە ناو کرۆکی یەکترناسینەکەی نێوان مەلا گۆرانی و مەلا یێگان، پێویستە تیشکێك بخەینە سەر ژیان و کەسایەتی مەلا یێگان، سەرچاوە تورکییەکان بە فراوانی لە بارەی ژیانی ئەم زانایە باسی لێوە دەکەین.

## ٢,٢ :مەلا یێگان کێیە؟:

ناوی محەمەد کوری ئەمەگانی کوری خەلیلە، بە یێگان ناسراوە، بە رەچەڵەك خەڵکی ئایدنە و لە سەردەمی موڕادی دووەم زانای مەزهەبی حەنەفی بووە. مێژووی لەدایکبوونی نەزانراوە بەڵام لە ساڵی ١٤٥٣ ز ٨٥٧ ك لە بورسە کۆچی دوایی کردووە و هەر لەوێ نێژراوە [١].

[1] الشقائق النعمانية في علماء الدولة العثمانية ، ص ٤٩

لە ئێستادا هیچ شوێنەوارێکی مەزارەکەی نەماوە، خوێندنی سەرەتایی لە ویلایەتی ئایدن تەواو دەکات، پاشان دێتە بۆرسە و دەبێتە قوتابی مەلا فەنەری، لای ئەو زانستە بنچینەکان دەخوێنێت و دوای وەرگرتنی ئینجازە لای ئەم زانایە دەستدەکات بە وتنەوەی وانە لە چەندین قوتابخانەی شاری بورسە. دوای مردنی مەلا فەنەری ١٤٣١ ز ٨٣٤ ك دەهێنرێتە جێگای ئەو و لە شاری بورسە دەبێتە قازی، بە گوێرەی سەرچاوەکان دەوترێت وەکو موفتی رەسمی دەوڵەتی عوسمانی بووە، بەڵام هەندێ لە توێژەرانی مێژوویی وای بۆ دەچن وەکو پلەی رەسمی موفتی نەبووە، بەڵکو تەنها مۆڵەتیپێدانی فتوای پێدراوە [١]. مەلا یێگانی لە سەردەمی موڕادی دووەم، لە ساڵی ٨٤٤ ك فەریزەی حەج بەجێ دەهێنێت. دوای گەڕانەوی لە حەج، هەندێ لە تویژەران دەڵێن کە هیچ ئەرکێکی وەرنەگرتووە، بەڵام هەندێکیتر دەڵێن گەڕاوەتەوە سەر کاری قازێتی پێشووی لە شاری بورسە و لە کاتی فەتحی ئەستەنبوڵ شان بە شانی قازێیەتی و موفتیەکانیتر رۆڵێکی کاریگەری بینیووە.

### ٢. ٣: یەکەم چاوپێکەوتنی نێوان مەلا گۆرانی و مەلا یێگان:

وەك لەسەرەوە ئاماژەمان پێکرد لە ساڵی ٨٤٤ ك مەلا یێگان لە بۆرسەی پایتەختی عوسمانیی بە ڕێدەکەوێت بەرەو حیجاز، بەمەبەستی جێبەجێ کردنی فەریزەی حەج، سەبارەت بە چۆنێتی و کاتی دیداری نێوان مەلا گۆران و مەلا یێگان، ئەوا سەرچاوە عەرەبییەکان هیچ زانیاریان نەداوە، تا

---

[1]Mefail HIZLI; XIX. Yüzyıl Ortalarında Bursa Medreseleri ve Müderrislerine Yapılan Yıllık Ödemelere Dair Bir Belge . ULUDAĞ ÜNİVERSİTESİ İLÂHİYAT FAKÜLTESİ DERGİSİ Cilt: 20, Sayı: 1, 2011 s , 6

ئـەو شـوێنە زانیاریـان بـە ئێمـە داوە، کـە دوایـین شـوێنی نیـشتەجێبوونی گۆرانی لە حەلەب یاخود ناوچەی فورات بووە، ئیتر لەوێ بەدواوە بێ ئومێـد دەبین لە بەدەستهێنانی زانیاری لە سەرچاوە عەرەبییەکان، بۆیە ناچارین بۆ ساغ کردنـەوەی ئـەم بابەتـە پـەنا بـۆ سەرچـاوە تورکییـەکان ببـەین، تاکـە سەرچاوەیەك کە باسی لەم چاوپێکەوتنە کردبێت، تاشکۆپەری زادەیـە، کـە لــە ســاڵی ٩٦٨ ك وەفــاتی کــردووە، بــەم شــێوەیە باســی ئــەم بابەتــە دەکات:دوای ئەوەی مەلا یێگان بەمەبەستی فەریزەی حەج بەرەو حیجاز بـە ڕێ دەکەوێت، بەڵام پێش گەیشتنی سەرێك لە قـاهیرە دەدات و لـەوێ مـەلا گۆرانی دەبینێ و لە کاتی گفتوگۆکردنـدا، مـەلا یێگـان بلیمـەتیی ئـەم زانـا مەزنەی بۆ دەردەکەوێت، بۆیە لەگەڵ خۆیدا دەیباتە بۆرسە بۆ لای سوڵتان موڕادخان[1].

دواتــر چــی سەرچــاوەی عوسمــانی و عــەرەبی هــەن، ئــەم بۆچــوونەی تاشکۆپەرییان بۆ نێو لاپەڕەی پەرتووکەکانیان گواسـتۆتەوە، ئـیتر بـەبێ ئەوەی کەسێك بەدواداچوونێکی بۆ ئەم بۆچوونە کردبێت.

بەڵام ئەم بۆچوونە دژیەکییـەکی تـەواوی لەگـەڵ سەرچـاوەکانی پـێش خۆی هەیە، بەم بەڵگانـەی لای خـوارەوە دەتـوانین بیـسەلمێنین کـە مـەلا یێگان لە قاهیرە مەلا گۆرانی نەبینیوە:

- تاشکۆپەری زادە لە سەردەمی مەلا گۆرانی نەژیاوە، بـەڵکوو نزیکـەی سەد ساڵێك لە نێوانیانـدا هەیـە، بۆیـە دەگـونجێ ئـەم بۆچـوونەی لـە ئیشتیهادی خۆی بێت، چونکە تاشکۆپەری لەبارەی سەرەتای ژیان و

[1] الشقائق النعمانية في علماء الدولة العثمانية ، ص ٥١

شـوێن و سـاڵی لـەدایکبوونی گـۆرانی و قۆناغـەکانی خوێنـدنی لـەو ناوچانەی ژیاوە تـا قـاهیرە، هـیچ زانیارییـەکی نـەداوە و راسـتەوخۆ هاتۆتە سەر بابەتی قۆناغی ئەنادۆڵ.

- بێگومان گۆرانی زۆر هەوڵیدا بگەڕێتـەوە قـاهیرە، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش نامـەی بـۆ سـوڵتان چـەقماق نووسـی، بـەڵام ئـەو قبـووڵی نـەکرد، قبـووڵکردنی گەڕنـەوەی گـۆرانی بـۆ قـاهیرە، بـە مانـای لێخۆشـبوونی دەهات.
- ئەگەر گۆرانی لە قاهیرە نیشتەجێ ببووایە، بێگومان دەگەڕایەوە سەر پیشە کۆنەکـەی خـۆی و بـە هـیچ جۆرێك رێـز و پایـەی سـوڵتانی بـە کەسێکیتر نەدەگۆڕیەوە، چونکە هیچ زەمانەتێك لەو بارەوە نەبوو کە ئاخۆ مەلا گۆرانی لە کاتی چوونی بۆ بورسە ژیانی لەوە باشتر دەبێـت یاخود نا؟!
- ئەگەر گۆرانی گەڕابووایەوە بۆ قاهیرە ئەوا بێگومان چ مێژوونووسـەکانی سەردەمی خـۆی و چ ئەوانـەی دواتـر ئاماژەیـان پـێ دەکـرد، بـۆ نمونـە بیقاعی کە هـاوڕێی گـۆرانی بـووە و لـە نێـوان ساڵانی (٨٠٩–٨٨٥) ك ژیـاوە، یـاخود ئـیبن حەجـەری مامۆسـتای کـە لـە نێـوان ٧٧٣–٨٥٢ك ژیـاوە، یـاخود ئیمـامی سـیوتی (٨٤٩–٩١١ك) یـاخود تـەغری بـەردی (٨١٣– ٨٧٤ ك)، یاخود ئیمامی مەقریزی (٧٦٤ – ٨٤٥ ك) ئەم زانایانە لە پەرتووکەکانیان ئاماژەیان بە ژیانی مەلا گۆرانی کـردووە، هـەموویان تا کۆتا شوێن، کە حەلـەب یـاخود فوڕاتـە ڕۆیـشتوون، دواتـر کۆتاییـان هێناوە، گەر وا بووایە دەبوو باسی سەردەمی قاهیرەیان کردبا.

- لــە ڕووی جوگرافیــاوە نێــوانی ئەدرنــەی پایتــەختی عوسمــانیی و قاهیرەی پایتەختی مەمالیك، ماوەیەكی ئێكجار زۆرە بـە تایبـەتی بـۆ ئەو سەردەمەش، هیچ زەرورەتێك لەوەدا نەبووە، كە مەلا پێگـان ئـەو هەموو مـاوە درێـژە بـۆ حـەجكردن ببڕێـت، ئەمـە سـەرەڕای ئـەوەش دوژمنایـەتی و ركابەرایەتییـەكی سـەخت هـەبووە لـە نێـوان ئـەم دوو دەوڵەتە مەزهەب حەنەفییە بۆ زانا و راوێژكاری سوڵتان مـوراد هـەر وا ئاسان نەبووە، كە پێ بخاتە پایتەختی دوژمنەكەی.

ئەی كەواتە مەلا پێگان لە كوێ دیـداری لەگـەڵ مـەلا گـۆرانی كـردووە، بەر لەوەی وەڵامی ئـەم پرسـیارە بدەینـەوە، ئێـستا كـاتی ئـەوە هـاتووە بزانین ئەو كات مەلا گۆرانی خۆی لە كوێ نیشتەجێ بـووە، وتمـان دوایـن شوێنی نیشتەجێبوونی گـۆرانی لـە نێـوان بۆچـوونی بیقـاعی و مـەقریزی ماوەتەوە، مەقریزی ڕای وایە لە فوڕات ماوەتـەوە، بیقـاعیش ڕای وایـە لـە حەلەب ماوەتەوە، بێگومان قورسە بتوانین هەر وا بـە ئاسـانی بۆچـوونێك پەسەند بكەین، بەڵام ئەگەر كەمێك لە هـەردوو بۆچـوونەكە ورد ببینـەوە، ئـەوە بۆچـوونەكەی بیقـاعی، كـە حەلەبـە، زیـاتر لـە ڕاسـتییەوە نـزیكن، چونكە ئەمە جگە لەوەی بیقـاعی هـاوڕێی گـۆرانی بـووە و ئـەو ناوچـەی زانـستی شـەرعی تیـادا خوێنـدووە وەكـو قـاهیرە جگـە لـەوەش چـەندین مامۆستای هاوبەشیان هەبووە، لەوانە ئیبن حەجەر و قەلقەشندی، خـۆی ئەوكاتە لە دیمەشق نیشتەجێ بووە، ئەمـە بـێ گومـان لـە بـارەی هـەواڵی گـۆرانی زۆر بـێ ئاگـا نـەبووە،[1] هەرچـی پەیوەنـدی بـە بۆچـوونەكەی

---

[1] برهان_الدين_البقاعي https://ar.wikipedia.org/wiki

مەقریزییەوە هەیە کە سەخاویش راستەوخۆ لـە ئـەمی وەرگرتـووە، ئـەوە بێ گومان  مەقریزی لە قاهیرە ژیا بوو، هەواڵیکی ئەوتۆی لـە بـارەی مـەلا گۆرانی نەبوو،ئەمە جگە لەوەی ئەو ساڵەی گۆرانی تووشی دوورخستنەوە دەبێت ئەوە ئیمامی مەقریزیش هەر لەهـەمان سـاڵ واتـە  لـە سـاڵی (٨٤٥ ك) کۆچـی دوایـی  دەکـات، جگـە لـەوەی مـەقریزی تـەنها نـاوی فـوڕاتی هێناوە، کە وەکو ئاشکرایە فوڕات گوزارشتە لـە ناوچـەیەکی بەرفراوان،لـە هەمان کاتدا گۆرانی تا  کۆتاییەکانی ئەم سـاڵە فـێرار دەبێـت، بۆیـە ئێمـە بۆچوونەکەی بیقاعی  وەکو ئەگەر وەردەگرین.

لە بارەی ناسـینی مـەلا یێگـان لەگـەڵ مـەلا گـۆرانی ئـەو ماوەیـە مـەلا گۆرانی، لـە حەلـەب  نیـشتەجێ دەبێـت  ماوەیـەکی زۆر سـەخت  دەبێـت بۆی، چونکە هیچ ئاسۆیەك  نا بینێت، بۆیە هەمیشە بـیر لـەوە دەکاتـەوە چۆن بتوانێ دووبـارە دەسـت بـە ژیـانێکی نـوێ بکاتـەوە، ئـەم ڕووداوەی حەمیـدەدین هــەر بــە تــەنها لــە قــاهیرە قــەتیس نــەما بــوو، بــەڵکوو دەنگدانەوەیـەکی زۆری بـەدوای خۆیـدا هێنـا بـوو، ڕەنگـە خـەڵکیش بـە چاوێکیتر سەیری مـەلا گۆرانییـان کردبێـت، بۆیـە گـۆرانی لـە بـیری ئـەوە دابوو، کە ناوچەیەکی دەرەوەی سنووری مـەمالیك هەڵبـژێرێت، لـەو سـاڵە واتــە دەورو بــەری کۆتــایی ٨٤٤ و ســەرەتایی ٨٤٥ ك چـاویان بـە یـەکتر دەکەوێت، مەلا یێگان بە مەبەستی چوونە حەج بـە شـاری حەلـەب تێپـەڕ دەبێت و لەوێ  چاوی بە مەلا گۆرانی دەکـەوێت،  پێدەچێت مـەلا یێگـان زانیاری هەبوو بێت لە بارەی ئەوەی مەلا گۆرانی لە حەلـەب نیـشتەجێیە، یاخود هەربێ ویست و  بەڕێی چارەنووسەوە چـاویان  بەیـەکتر کـەوتووە،

بەڵام ئەحمەد ئاتێش ڕایەکیتر پێشنیاز دەکات، ئەویش ئەوەیە مەلا گۆرانی بیستبووی سوڵتان موڕادی دووەم زۆر گرنگی بە زانایان دەدات و ڕێزێکی بێپایانیان لێدەگرێت و بانگی سنووری ژێر دەسەڵاتی خۆیانیان دەکات، یاخود خۆی لە مەلا یێگانی بیستووە، بۆیە لەگەڵی دەچێتە بۆرسە. گۆرانی کاتێک چاوی بە مەلا یێگان دەکەوێت، دەکەونە گفتوگۆکردن و لە کاتی قسەکردندا مەلا یێگان زۆر سەرسام دەبێت بە زیرەکی و ڕەوانبێژی گۆرانی و گۆرانی باسی قۆناغەکانی خوێندن و مامۆستاکانی لای مەلا یێگانی کردبوو. بۆیە مەلا یێگانی دەکەوێتە خەیاڵی ئەوەی چۆن دەوڵەتی عالی بتوانێ سوود لە زانایی و دانایی گۆرانی وەربگرێت، مەلا یێگانی بێ سێ و دوو پێشنیازی بانگهێشکردنی مەلا گۆرانی دەکات، دوای ئەوەی مەرجەکانی بۆ گۆرانی ڕوون دەکاتەوە. وە گۆرانی لەم بارەیەوە هیچ دوودڵییەك پیشان نادات، ئەگەر مەلا گۆرانی خۆشی ئەو داوایەی نە کردبێت ئەوە بێ گومان هیچ دوودڵییەکی نیشان نەداوە، لە هەمان کاتدا گۆرانی ناتوانێ وەرزی حەج لەگەڵ مەلا یێگان ئەنجام بدات بەهۆی ئەوەی ئەو کەسێکی ڕاکردووە، بۆیە هەردوو لا ڕێك دەکەون لەسەر ئەوەی کە مەلا یێگان لە کاتی تەواو کردنی وەرزی حەج کردن بە حەلەب دا بگەڕێتەوە و لەگەڵ خۆشی مەلا گۆرانی بباتە ئەنادۆڵ.

مەلا گۆرانی بە درێژایی فەریزەی حەج، چاوەڕێی گەڕانەوەی مەلا یێگان دەکات، کاتێك دەگەڕێتەوە شاری حەلەب، ئەوە لەسەر بەڵێنەکەی خۆی دەبێت و بەیەکەوە ڕوو لە ئەنادۆڵ دەکەن [1].

---

[1] İA, C.8 “Molla Gürani” ‘den sadeleştirerek, ilavelerle yayına hazırlayan Erol KÖMÜR

## ٢ . ٤: لە بارەی سوڵتان موڕادی دووەمەوە:

موڕاد کوڕی سوڵتان محەمەد چەلەبییە لە ساڵی ٨٠٦ك لە دایکبووە. دوای وەفاتی باوکی لە ساڵی ٨٢٤ك دەسەڵاتی گرتە دەست، کاتێك لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا بوو، دەیویست میرنشینەکانی ئەنادۆڵ بگێڕێتەوە بۆ دەوڵەتی عوسمانیی دوای ئەوەی تەیمووری لەنگ گرتبوونی، کاتێك دەستی گرت بەسەر ناوچەکەدا، بۆ ئەمەش ئاگربەستێکی لەگەڵ پاشای مەجەڕ ماوەی پێنج ساڵ بەست، وە لەگەڵ ئەمیری قرمان ڕێکەوت.

ئیمپڕاتۆری قوستەنتینیە هەڕەشەی لێکرد بە ئازادکردنی مامی موستەفای کوڕی بایەزید، ئەگەر سوڵتان هەوڵی شەڕ بدات لەگەڵی و براکەی خۆی وەك بارمتەیەك نەداتێ، بۆ ئەوەی شەڕ ڕوونەدات، بەڵام سوڵتان ئەو داوایەی ڕەتکردەوە، لەبەرئەوە ئیمپڕاتۆر، مستەفا کوڕی بایەزیدی بەردا و بە دەیان بەلەم پاڵپشتی کرد، بۆئەوەی هێرش بکاتە سەر سوڵتان و بە سوپای سوڵتان گەیشتن و سوپای سوڵتان سەرکەوتن بەسەریاندا و سەربازەکانی موستەفای کوڕی بایەزید پشتیان بەردا، گرتیان و لە سێدارەیاندا.

موڕادی دووەم، شەشەم سوڵتانی عوسمانییەکانە، لە نێوان ساڵانی ١٤٠٢ و ١٤٥١ دا ژیاوە، زۆر حەزی بە شیعر کردووە و دایناوە و شارەزایی هەبووە و یەکەم سوڵتانی عوسمانییە و کە گرنگی بە خەتی عەرەبی داوە و فێربووە، و بە خواپەرستی و خۆشەویستی بۆ تێکۆشان لە ڕێگەی خوادا ناسرابوو.

### ٢. ٥: هەوڵەکانی لە ئەوروپادا

سـولّتان مـوراد بـۆ تۆڵەسـەندنەوە لـە ئیمپراتـۆر، گـەمارۆی قوستەنتینیەیدا، بەڵام نەیتوانی فەتحی بکات، مستەفای برای بە هاوکاری فەرمانڕەوای ناوچەکان لە بەرانبەری وەستا، بەڵام تێکی شکاند و کوشتی و چەند میرنشینێکی ئەنادۆڵی گێڕایەوە، کە ئایدین و منتشا و سارۆخان و قرامـان بـوون، پاشـان بـەرەو ئـەورووپا ڕۆیـشت وەك تێکۆشـان و دەرسدادانێکی ئەوروپییەکان لەبەر سوود وەرگرتنیان لە ڕۆژانـی ناسـۆری سولّتان بایەزیددا. فەتحی مەجەڕی کرد و جزیـەی لەسـەر ئـەمیری سـڕب دانا، لەگەڵ پێشکەشکردنی تیپێك سەربازی سڕبی لە شەڕەکانیدا یارمەتی سولّتان بدەن، شاری سالۆنیکی گێڕایەوە لەگەڵ ئەفلاق و ئەلبانیا، کاتێك خۆی ئامادە ئەکرد بۆ گـەمارۆی قوسـتەنتینیە، فـەرمانڕەوا ئەوروپیـەکان پەیماننامەکەیان لەگەڵی شکاند، ئەمیش جارێکیتر بۆیان دەرچوویەوە، و ڕووبـەڕووی پاشـای مەجـەڕ و ئـەفلاق و سـڕب بوویـەوە و سـوپاکەی لـە ترانسلڤانیا تێکشکا کە بەشێك بوو لە موڵکەکانی مەجەڕ.

کاتێك سولّتان موڕادی دووەم فەتحی سالۆنیکی کرد و بە سـەرکەوتوویی چووە شارەکەوە وەفدێك لە شاری (یانیا)ی ئیتاڵی بـۆلای هـاتن، ئەوکاتانـە یانیا لەژێر دەسـەڵاتی خێزانـی تۆکـۆی ئیتاڵیـدا بـوو، کاتێـك کـارلۆ تۆکـۆی یەکەم ساڵی ١٤٣٠ز مرد، لەناو خێزانەکـەدا لەسـەر جێگرتنـەوەی بـوو بـە نـاکۆکی، چـەند سـەردەمێکی ئـاژاوە و بەیەکـدادان و کوشـتاری ڕووبـەڕووی خەڵکەکە بوویەوە، و کاتێك بیستیان سولّتان مـوڕادی دووەم هاتۆتـە شـاری سالۆنیك لە نزیکیان، وەفدێکیان نارد بۆ لای.

وەفدەکە داوایان لە سوڵتان کرد یارمەتیان بدا لەو تەنگەژەیەی ڕووی تێکردوون و کاتێک سوڵتان پێی وتن ئەو کێشەیە لە نێوان ئەوان و فەرمانڕەواکانیاندایە و پەیوەندی بەوەوە نییە، وەفدەکە پێیان وت ئێمە مەسیحیین، بەڵام زۆرمان لەسەر دادپەروەری موسوڵمانان بیستووە، لەبەرئەوە داواتان لێدەکەین سەرپەرشتیتان ئێمەش بگرێتەوە و حوکمی وڵاتەکەمان بکەن و لە فەرمانڕەوا ستەمکارەکانمان ڕزگارمان بکەن.

سوڵتان وەڵامی داواکەی دانەوە و یەکێك لەسەرکردەکانی لەسەری سوپاکەیدا نارد و شارەکەیان فەتح کرد، لە هەمان ساڵدا یان لە ساڵی ١٤٣١ز پەیماننامەیەکی لەگەڵ پاشای مەجەڕ بەست، تیایدا وازی لە ئەفلاق هێنا و چەند ناوچەیەکی بۆ سرب گێڕایەوە، و ئاگربەست لە نێوان هەردوو لادا بۆ ماوەی دە ساڵ کرا، و کاتێك عەلای کوڕی مرد زۆر بێتاقەت بوو و خۆی لە دونیا دوورخستەوە و وازی لە حوکم هێنان بۆ محەمەدی کوڕی، کە لە تەمەنی ١٤ ساڵیدا بوو. وپاپا سوودی لەو فرسەتە وەرگرت و داوای لە پاشا ئەوروپییەکان کرد بۆ هەڵمەتێکی خاچپەرستی نوێ، پاشای مەجەڕ سوور بوو لەسەر هەڵوەشاندنەوەی گرێبەست لەگەڵیدا، و سوڵتان بینی کوڕەکەی منداڵە و ناتوانێت ڕووبەڕوویان بێتەوە، خۆی هاتەوە بۆ سەرکردایەتی سوپا و خاچپەرستەکانی لە قارنای بولگاریا تێکشکاندن و پاشای مەجەڕی کوشت و سەربازگەکانی دوژمنی گرت، و نوێنەری پاپای کوشت و سەرکەوتنی بۆ موسڵمانان تەواو کرد، پاشان دەرسی سوپای ئینکیشاری عوسمانی دادا، لەبەرئەوەی کوڕەکەیان بچووك کردەوە و سەرگەرمی کردن بە شەڕەوە لە یۆنان.

و سولّتان موراد له تەمەنی ٤٩ ساڵیدا و له ساڵی ٨٥٥ك له ئەدەرنـه کاتێك خـۆی بـۆ فـەتحی ئـاق حەسـار ئامادەئـەکرد کۆچـی دوایـی کـرد، و تەرمەکەی گوێزرایەوە بۆ بۆرسه و لەوێ نێژرا.

## ٦.٢:چوونی مەلا گۆرانی بۆ ئەنادۆڵ:

مەلا یێگان وای دەبینی مەلا گۆرانی وەکو دیارییەك بۆ سولّتان موڕادی بـردووە، هـەر یەکـە لـە تاشـکۆپەری زادە و کنـوی هینـدی یەکـەم چـاوپێکەوتنی مـەلا گـۆرانی و سـولّتان مـورادی دووەم بـەم چـیرۆکە دەستپێدەکەن:

کاتێك مەلا یێگان چاوی بە سولّتان دەکەوێت، لێی دەپرسێت:ئایا هـیچ دیارییەکت بۆمان هێناوە (مەبەستی سولّتان ئەوەبوو، کە مـەلا یێگـان لـە حەج گەڕاوەتەوەو وەکو نەریتێك دەبێت دیارییەك بە سولّتان بدات)

مـەلا یێگـان وەڵامـی سـولّتانی دایـەوە:بـەڵێ پیـاوێکی موفەسـیر و موحەدیس لەگەڵم دایە.

سولّتان:ئایا لە کوێیە؟

مەلا یێگان:لە لای دەرگا چاوەڕێیە.

سولّتان کەسێکی نارد بەدوای تا مەلا گۆرانی بهێنێتـە ژوورەوە، کاتێـك گۆرانی هاتە ژوورەوە سـلاوی کـرد و کەوتنـە گفتوگـۆ کـردن، بـۆ مـاوەی کاتژمێرێك، قسە زانیاریەکانی گۆرانی زۆر سەرنجی سولّتانی راکێشا، بۆیـە لـە لای خـۆیی لـە قوتابخانـەی سـولّتان مـوڕادی باپیری وەکـو مامۆسـتا دایمەزراند.[1]

---

[1] کۆبەری زادە ، ص ٥١ . الکنوی الهندی ، ص ٤٨

ئەحمەد ئاتێش ئاماژە بەوە دەکات لە کاتی گفتوگۆی نێوان سوڵتان و مەلا گۆرانی، گۆرانی کێشەکەی لەگەڵ حەمیدەدین بۆ سوڵتان باس نەکردووە، چونکە نەیویستووە ئەوەی بەسەری هاتووە بە بیری بێتەوە.

بەڵام ساکیب یلدز لە دکتۆراکەی گومان دەخاتە سەر ئەم گێڕانەوەیە و وای نابینێت، کە مەلا یێگان مەلا گۆرانی وەکو دیاریی بۆ سوڵتان موڕاد بردبێت، ئەویش بە پشتبەستن بە بەڵگەنامەیەکی عوسمانیی کە خۆی لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی لە ئەرشیفی دەوڵەتی عوسمانیی دەستی کەوتووە، یلدز ناوەڕۆکی بەڵگەنامەکە ئاشکرا دەکات و دەنووسێت:مەلا یێگان بە خەتی خۆی نامەیەك بۆ سوڵتان موڕاد دەنووسێت، کە ناوەڕۆکی بەڵگەنامەکە بەوە دەست پێدەکات:دوای سڵاو ڕێز، سوڵتانی من، چاوی هەردوو شاه ماچ دەکەم، ئەوەتا مەلا گۆرانی هات، چی فەرمان دەکەن، ئایا یەکسەر بینێرم بۆ لای جەنابتان، یاخود لێرەدا یەك دوو ڕۆژ دوای بخەم؟ چاوەڕێی هەواڵی ئێوەم [1].

ئەو بەشەی بەڵگەنامەکە پەیوەندیدارە بە بابەتەکە، دەیخەینە ژێر وتووێژی مێژوویی،ئەو دوو دێڕەی ناو بەڵگەنامەکە لە چەند ڕاستییەك نزیکمان دەخەنەوە:

- مەلا یێگان بەر لەوەی بچێتە حەج، چاوی بە گۆرانی کەوتووە، وتوێژیان کردووە ڕێککەوتوون لەسەر ئەوەی لە کاتی گەڕانەوەی مەلا یێگان لە حەج، بەیەکەوە بڕۆنە ئەنادۆڵ، بۆیە هەر لەو کاتەدا مەلا یێگان هەواڵ بۆ سوڵتان داوای بۆچوونی سوڵتان دەنێرێت لەو

[1] YILDZ : S 49-50

بارەیەوە دەکات، سولّتانیش وەلاّمەکەی ئەرێنی دەبێت. بۆیە لە کاتی گەڕانەوەی لە حەج بەیەکەوە دێنە ئەنەدۆلّ. مەلا یێگانی بەو پێیەی پێشتر وەسفی مەلا گۆرانی بۆ سولّتان ناردووە، بۆیە کاتێك نامەی بۆ سولّتان ناردووە، ڕاستەوخۆ نووسیویەتی (ئەوەتا مەلا گۆرانی هات)، واتە پێویستی نەکردووە، دووبارە مەلا گۆرانی بە سولّتان بناسێنێتەوە.

- نووسینی ئەم نامەیەی مەلا یێگان لەگەلّ ئەو متمانە زۆرەی بە گۆرانی هەبووە، ڕەنگە گۆرانی لە یەکەم چاوپێکەوتنی باسی ورد و درشتی ڕووداوەی دوورخستنەوەکەی بۆ مەلا یێگان کردبێت، یاخود ڕەنگە مەلا یێگان زوو لە کەسایەتی مەلا گۆرانی گەیشتبێت و لێکۆلّینەوەشی لەو بارەیەوە کردبێت.

- دەربارەی ئەوەی کە ئایا مەلا گۆرانی و مەلا یێگان سەرەتا لە چ

شوێنیك ماونەتەوە لە ئەنەدۆلّ، بە گوێرەی ئەو نامە کە مەلا یێگان ئەو گوزارشتە دەردەبڕێت، یەکسەر بینێرم یاخود یەك دوو ڕۆژ دوای بخەم؟ لە کاتێکدا سەرچاوەکان وا نیشان دەدن کە مەلا گۆرانی و مەلا یێگان پێکەوە راستەوخۆ هاتوونەتە شاری ئەدرنەو لە لای کۆشکی سولّتان گیرساونەتەوە. مەلا یێگان سەرەتا دەچێتە ژوورە وە بۆ لای سولّتان و لە دواتریش مەلا گۆرانی وەکو دیاری حەج پێشکەش بە سولّتان دەکات. بەلاّم لەم نامەی سەرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم بۆچوونە هەلّەیە؟ چونکە وا دەردەکەوێت کە راستەوخۆ نەهاتونەتە شاری ئەدرنە ! وەکو

له بەڵگەنامەکەدا مەلا ییّگان وشەی (ئێرەی ) بە کارهێناوە، بۆیە وای بۆ دەچین کە ئەو شوێنە شاری بورسە بێت؟ چونکە بورسە شوێنی وتنەوەی وانەی مەلا ییّگان بووە. ئەگەر راستەوخۆ بهاتبونایە ئەدرنە ئەوە پێویستی نەدەکرد مەلا ییّگان ئەو نامە بۆ سوڵتان بنێرێت. بۆیە دەتوانین بڵێین مەلا گۆرانی سەرەتا هاتۆتە شاری بورسە و لەوێ ماوەتەوەو چاوەڕێ بووە، تا هەواڵی لە سوڵتان بۆ هاتووە.

سەرنجێکی تر هەر لەبارەی ئەم نامەیەو ئەویش ئەوەیە ئەگەر سەرنج بدەین لەبارەی ئەو نامەیەی، کە ئایا مەلا گۆرانی چۆتە شاری ئەدرنە بۆ بینینی سوڵتان موارد، وەکو ئەوەی سەرچاوەکان ئاماژەی بۆ دەکەن؟ ئەگەر گۆرانی چووبێتە ئەدرنە ئەوە مەلا ییّگان لەگەڵیدا بووە یاخود نا؟ بە سەرنجدان لە ڕستەی مەلا گۆرانی بنێرم یاخود یەك دوو رۆژ لێرە دوای بخەم لەوە تێدەگەین مەلا ییّگان ویستویەتی مەلا گۆرانی بە تەنها بۆ لای سوڵتان بنێرێت، یاخود ڕەنگە سوڵتان موڕاد نەیوتبێت بابێت، بەڵکو با لە بۆرسە بمێنێتەوە و لەوێ دەست بە گوتنەوەی وانە بکات. رەنگە دوای وەرگرتنی ڕەزامەندی سوڵتان چووبێتە لای سوڵتان [1].

[1] YILDIZ : S 51

## ٢. ٧ :نیشتەجێبوونی گۆرانی لە شاری بورسە:

نیشتەجێبوونی گۆرانی لە شاری بورسە و دوای ئەو هەموو ڕێز و پلەو پایەی، کە لە لایەن سوڵتان موڕادی دووەم پێی بەخشرا، توانی کەمێك دەروونی گۆرانی ئارام بکاتەوە، هەر چەندە ڕووداوەکەی قاهیرە گاریگەریەکی قووڵی لای گۆرانی دورستکردبوو، سەرچاوەکان لە نێوان ناسینی مەلا گۆرانی و سوڵتان موراد، تا بوونی بە مامۆستای کوڕەکەی سوڵتان محەمەد فاتیح زانیارییەکی ئەوتۆیان نەداوە، تەنها چەند شتێکی کەم نەبێت، سەبارەت بە سەرچاوە عەرەبیەکان تا دورخستنەوەی مەلا گۆرانی لە قاهیرە زانیاری باشیان دابوو، بەڵام لەم ساڵەوە واتە (٨٤٤ ك) هیچ زانیاریەکی ئەوتۆمان لە بارەی مەلا گۆرانی بەرچاو ناکەوێت، لەم بارەیەوە ناچارین بۆ وەرگرتنی زانیاری پەنا بۆ دوو جۆر لە سەرچاوە ببەین، ئەوانیش بەڵگەنامەی عوسمانی و سەرچاوە تورکییەکانە، جارێ سەبارەت بە بەڵگەنامەی عوسمانی، دوای گەڕان و وردبوونەوەیەکی چڕ، نەمانتوانی هیچ شێك بدۆزینەوە، بۆیە ئێستا ئەوەی بتوانین سوودی لێوەربگرین، سەرچاوە عوسمانییەکانە، کە ئەویش تاکە سەرچاوە، کە باسی ئەم ماوەیە بکات مێژوو نووسی عوسمانی تاشکۆپەری زادەیە، کە ئەویش تەنها ئاماژەی بەوە کردووە، دوای ئەوەی گۆرانی یەك کاتژمێر قسە و گفتوگۆ لەگەڵ سوڵتان موراد دەکات، زۆر سەرنجی سوڵتان بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت، لە بەرامبەر ئەمەدا وەکو مامۆستا لە قوتابخانەی باپیری سوڵتان موراد غازی، کە هەندێ سەرچاوە بە قوتابخانەی (کاپڵجە)

ناویان بردووه له شاری بۆرسه دایدەمەزرێنێ، دواتر له قوتابخانەیەکی تریش وانه دەڵێتەوه کە ئەویش قوتابخانەی باپیری سوڵتانه، واته بایەزیدخان یلدرم بوو له هەمان شاردا [1].

به سەرنجدان له وشەی پێبەخشین کە کۆپەری زاده بۆ مەلا گۆرانی بەکاریهێناوە، بەو مانایه دێت سوڵتان موراد تەنها وەکو مامۆستایەکی ڕووت سەیری مەلا گۆرانی نەکردووە، بەڵکو وەکو ڕێزێك هەردوو قوتابخانەی به ناوی دوو باپیری خۆیی به مەلا گۆرانی بەخشیوەتی کە ئەمش هاوکات بوو لەگەڵ کۆتایی ٨٤٥ کۆچی و سەرەتای ١٤٤٢ زاینی.

بەڵام مێژوونووسی کورد ئەمین زەکی ناوی قوتابخانەیەکی تری هێناوه، بەناوی (خوداندکار ) له جێگای ناوی قوتابخانەی سوڵتان موراد، [2] هەرچەنده گەڕانێکی زۆرمان کرد بۆ پەراوێزی پەرتووکەکەی، بەڵام هیچی نەنووسی بوو، تەنانەت بۆ دڵنیابوونیش سەیری زۆر سەرچاوەی ترمان کرد، نەمان دۆزییەوە،تەنها پەرتووکی مێژووی زانایانی– کوردی مامۆستا تاهیر بەحرکەیی نەبێت، کە ئەمیش هەر له ئەمین زەکی وەرگرتبوو [3]، بەڵام ئێمه ئەو بۆچوونەی مامۆستا ئەمین زەکیش بەهەند وەردەگرین، چونکه دڵنیاین هیچ شتێکی له خۆوه نەنووسیوه.

---

[1] طاشکوبەزری ، ص ٥١

[2] م ص ، ص ٢٣٤

[3] تاهیر بەحرکەی : میژووی زانایانی کورد ، بەرگی یەکەم ، ل ٧٤

### ٨,٢: بوونی گۆرانی بە مامۆستای محەمەد فاتیح:

### ٢. ٩: پوختەیەك لە ژیان و كارەكانی سوڵتان محەمەد فاتیح:

حەوتەم سوڵتانی دەوڵەتی عوسمانییە، لەگەڵ فاتیحدا بە باوكی فەتحەكان و باوكی چاكەكان ناوبراوە، لە دوای فەتحی قوستەنتینیە، نازناوی قەیسەر خراوەتە سەر نازناوەكانی، نزیكەی ٣٠ ساڵ حوكمی كردووە، كە ئەو ماوەیە فراوانكردنی گەورە بوو بۆ خەلافەتی ئیسلامی.

ئەم سوڵتانە بە تەواوی دەستی بەسەر ئیمپڕاتۆری بیزەنتی گرت، دوای ئەوەی یازدە سەدە بەردەوام بوو، زۆربەی مێژوونووسان ئەم ڕووداوە بە كۆتایی سەردەمەكانی ناوەڕاست و سەرەتای سەردەمە تازەكان دادەنێن، لای توركەكان ئەو سەردەمە (كرانەوەی سەردەمی پاشاكانە) بە توركی (çağ açan hükümdar).

سوڵتان محەمەد بەدوای فەتحەكانیدا چوو لە ئاسیا شانشینی ئەنادۆڵی كرد بە یەك و بەرەو ئەورووپا ڕۆیشت، تا گەیشتە بەلەگراد، لە دیارترین ئیشە كارگێڕییەكانی، لكاندنی كارگێڕییە كۆنە بیزەنتییەكان بوو بە دەوڵەتی عوسمانی فراوانەوە، محەمەد فاتیح خاوەن ڕۆشنبیرییەكی بەرز بووە و زانست و زانایانی خۆشویستوون و لەگەڵ زمانی توركیشدا بە چەند زمانێكی تر قسەی كردووە، كە ئەوانیش فەڕەنسی ولاتینی و یۆنانی و سڕبی و فارسی و عەرەبی و عیبری بوون.

سوڵتان سەركردایەتی هەڵمەتێكی كرد، كە دیاری نەكراوە بۆ كوێ، لەبەر ئەوە سوڵتان سووربوو لەسەر ئەوەی پلانەكانی بە كەس نەڵێت، تەنانەت نزیكترین وخۆشەویسترین سەركردەكانی، بەڵام مێژوونووسان لەو

باوەڕەدان بۆ ئیتاڵیا بووە، خەڵکی بوندقیە داوایان لە پزیشکە تایبەتەکەی کرد (یەعقوب پاشا) تا بیکوژێت، یەعقوب لە سەرەتاوە موسڵمان نەبووە ئیتاڵیا لە دایك بووە پاشان موسڵمان بووە، یەعقوب دەستی کردبە پێدانی ژەهر بە هێواشی بە سوڵتان، بەڵام کاتێك بە هەڵمەتەکەی زانیوە، ژەهرەکەی بۆ زیاد کردووە، وسوڵتان کۆچی دوایی کرد لە ٣ی ئایاری ١٤٨١زدا، لە تەمەنی ٥٣ ساڵیداکۆچی دوایی کرد، ماوەی حوکمەکە ٣١ ساڵ بوو، کە بەسەری برد لە شەڕە یەك لە دوای یەکەکاندا بۆ فەتح کردن و بەهێزکردنی دەوڵەتەکەی، مەبەستەکەی باپیرەکانی هێنایە دی، فەتحی قوستەنتینیەی کرد، لەگەڵ هەموو مەمالیك و هەرێمەکانی ئاسیای بچوك و سرب و بەشناق و ئەلبانیا و زۆر دەستکەوتی کارگێڕی ناوخۆیی هەبوو، کە دەوڵەتەکەی خستە سەر ڕێگەی گەشەسەندن و ڕێگەی کردەوە بۆ سوڵتانەکانی دوای خۆی بۆ فراوانکردنی دەوڵەت و فەتحی هەرێمی تر.

## ٢. ١٠: لەدایکبوون وپەروەردەبوونی و گرتنە دەستی دەسەڵات:

محەمەدی دووەم کوڕی موڕادی دووەم و هوما خاتوونە، حەوتەم نەوەی سوڵتان عوسمانیی یەکەمە، لە ٢٠ی نیسانی ١٤٢٩ز لە شاری ئەدەرنەی پایتەختی ئەو کاتەی دەوڵەتی عوسمانی لەدایکبووە، محەمەد لە سەردەمی باوکیدا ئاگاداری ئیشە سوڵتانییەکان بوو و دەژیا لەگەڵ ناکۆکییەکانی دەوڵەتی بیزەنتی لە کاتە جیاجیاکاندا هەروەها ئاگاداری تەواوی هەوڵەکانی پێشتری عوسمانییەکان بوو بۆ فەتحی قوستەنتینیە تەنانەت ئاگاداری هەموو هەوڵەکان بوو لە سەردەمی ئیسلامییە

دێرینەکاندا. بە پەروەردەی ئیسلامی پەروەردە کرا، کە کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لەسەر کەسایەتی محەمەد فاتیح، کە موسڵمان ولە خواترس وپابەند بوو بە سنوورەکانی شەریعەت، دەستی ئەگرت بە فەرمان و نەهی لێکراوەکانەوەە، بەرەنگاری لە بەدواداچوون و جێبەجێکردنیدا دەکرد، کاریگەر بوو بە زانا خواپەرستەکان، بەتایبەت مامۆستاکەی (گۆرانی)[١]

کاتێك عەلائەدینی کوڕە گەورەی سوڵتان موڕادی دووەم کۆچی دوایی کرد، سوڵتان زۆر خەفەتبار بوو، بۆ محەمەدی کوڕی وازی لە دەسەڵات هێنا کە ئەو کاتە تەمەنی چواردە ساڵ بوو، بەڵام چەند مانگێك تێپەڕ نەبوو کاتێك هەواڵی غەدری مەجەریان پێدا سوڵتان محەمەد فاتیح داوای لە باوکی کرد بگەڕێتەوە و حساب بۆ شەڕی مەجەڕ بکات، بەڵام موڕاد ڕەتی کردەوە و محەمەد فاتیح وەڵامی بۆ نووسی (ئەگەر تۆ سوڵتانیت وەرە و بوەستە لە سەرکردایەتی سوپاکەت و سەرۆکایەتی دەوڵەتەکەت و ئەگەر من سوڵتانم فەرمانت پێ ئەکەم بە سەرکردایەتی سوپا)، لەسەر ئەم پەیامەوە سوڵتان موڕادی دووەم گەڕایەوە و سەرکردایەتی سوپای عوسمانیی کرد لە شەڕی فارنا کە موسڵمانان تیایدا سەرکەوتنێکی گەورەیان لە ساڵی ١٤٤٤ز بە دەستهێنا.[٢]

فاتیح چووە مانیسا لە ڕۆژئاوای ئەنادۆڵ لە دوای شۆڕشی ئینکیشاریەکان لەسەری، کاتێك باوکی کۆی کردنەوە و گواستنیەوە بۆ شەڕەکانی ئەوروپا، لەم ماوەیەدا فاتیح ژنی هێنا، کە (ئامینە گوڵبەهار)

---

[1] Hüseyin : s ٢٥٦

[2] Hüseyin : s 23

بوو و له ساڵی کۆچی دوایی کرد ١٤٩٢، دوای ئەوەی سوڵتان بایەزیدی دووەمی کوڕی لەدایك بوو، سوڵتان موڕادی دووەم جارێکیتر گەڕایەوە بۆ گۆشەگیری، دوای ئەوەی بەسەر مەجەڕدا سەرکەوت و شاری فارنای لیٚ پاککردنەوە، ئەم جارەش زۆر نەمایەوە کە ئینکیشارییەکانی سوپا بە کەمی سەیری سوڵتان محەمەدیان کرد و ئەدەرنەی پایتەختیان تالاَن کرد، سوڵتان موڕاد ساڵی ١٤٤٥ گەڕایەوە بۆیان و ئاژاوەکەی کوژاندنەوە بە سەرگەرمی کردن بە شەڕەوە، هێرشی بردە سەر وڵاتی یۆنان و سڕب لە ماوەی ساڵەکانی تردا، چەندین شار و میرنشینی فەتح کرد وخستنیە پاڵ دەوڵەتی عوسمانیی، هەر لەم ماوەیەدا فاتیح ژنی دووەمی هێنا (سنی موکرەم خاتوون). هەر لەم ماوەیەدا فاتیح دراوی سەلجوقی بە ناوی خۆیەوەلێدا و دەرکرد.

لە ساڵی ١٤٤٩ دایکی کۆچی دوایی کرد و ساڵێك دواتر باوکی لە ٧ی شوباتی ١٤٥١ز وەفاتی کرد.

کاتێك هەواڵی مردنی سوڵتان بە محەمەدی دووەم (فاتیح) گەیشت، بەپەلە بۆ ئەدەرنە گەڕایەوە وجارێکیتر بوو بە سوڵتان لە ١٩ی شوباتی ١٤٥١زدا، جەنازەی باوکی بەجیٚ گەیاند وفەرمانی کرد بگوێزرێتەوە بۆ بۆرسە، تا لەویٚ بنێژرێت. کاتێك محەمەدی دووەم دوای باوکی دەسەڵاتی گرتە دەست هەموو ئاسیای بچوك لەژێر دەستیدا بوو، تەنها قەرمان شاری سینۆب و شانشینی تەڕابزۆنی ڕۆمی نەبێت، شانشینی ڕۆمی ڕۆژهەڵات لە شاری قوستەنتینیە دابڕا بوو و دەوروپشتی و هەرێمی مۆرە لە نێوان چەند میرنشینێکی بچوکدا دابەشببوو.



**محەمەد فاتیح**

سوڵتان محەمەدی دووەم، دوای وەفاتی باوکی، خۆی بۆ فەتحی پاشماوەی وڵاتی بەلقان وشاری قوستەنتینیە ئامادەکرد، تا هەموو موڵکەکانی پەیوەندیان بەیەکەوە هەبێت و هیچ کام لە دوژمن و هێرشکەر و هاوڕێ دووڕووەکان نەتوانن تێکی بدەن، سەرەتا هەوڵێکی مەزنیدا بۆ

بەهێزکردنی سوپای عوسمانیی، ژمارەی سوپاکەی گەیشتە (٢٥٠هەزار) سەرباز، کە ئەو ژمارەیە زۆر زیاترە بە بەراورد لەگەڵ ژمارەی سوپاکانی ئەو سەردەمە، هەروەها گرنگییەکی تایبەتیدا بە ڕاهێنانی ئەو سەربازانە لەسەر هونەرە جیاوازەکانی جەنگ وجۆرەکانی چەك، هەروەك گرنگیدا بە بەهێزکردنی ڕۆحی مەعنەوی سەربازەکان و بیری ستایشی پێغەمبەری (د.خ) دەخستنەوە بۆ ئەو سوپایەی کە فەتحی قوستەنتینیە ئەکەن، کە ڕۆحێکی مەعنەوی زۆر بەرز و ئازایەتییەکی بێ وێنەی پێ بەخشین، هەروەك بڵاوبوونەوەی زاناکان لەناو سوپادا کاریگەرییەکی گەورەی لە بەهێزکردنی ورە و باوەڕیان هەبوو.

سوڵتان دەیویست پێش فەتحی قوستەنتینیە، گەرووی بۆسفۆر لە هەر هێرشێك لە شانشینی تەڕابزۆنەوە بپارێزێت، بۆ ئەمەش قەڵایەکی لەسەر کەناری گەرووەکە لە تەسکترین خاڵی لە ڕووی ئەوروپاوە دامەزراند،کە قەڵایەکی بەرز و بەهێز بوو و بەرزییەکەی گەیشتە ٨٢ مەتر و ناونرا بە (قەڵای ڕوملی حەسار)، لە بەرانبەر ئەو قەڵایەی پێشتر سوڵتان بایەزیدی یەکەم بنیاتی نابوو.

سوڵتان گرنگییەکی گەورەیدا بە کۆکردنەوەی چەکی پێویست بۆ فەتحی قوستەنتینیە، لە هەمووی گرنگتر تۆپخانە بوو و هەروەك فاتیح گرنگییەکی تەواویدا بە کەشتیگەلی عوسمانیی، بەهێزی کرد و کەشتی جیاوازی بۆ زیادکردن، تاکو بە ئیشی خۆیان هەستن کاتێك هێرش دەکەنە سەر قوستەنتینیە، وا باس دەکرێ زیاتر لە (٤٠٠) کەشتی بۆ ئەو مەبەستە ئامادەکردووە.

پێش ئەوەی هێرش بکاتە سەر قوستەنتینیە، فاتیح ئیشی لەسەر بەستنی پەیماننامەکان لەگەڵ دوژمنە جیاوازەکانی کرد، تا یەکلا بێتەوە بۆ یەك دوژمن، پەیماننامەی کرد لەگەڵ میرنشینی غەرناتە، کە دەوری قوستەنتینیەیان لە ڕۆژهەڵات داوە، هەروەها لەگەڵ جنوە و بوندقیە، کە لە میرنشینە ئەوروپییەکان بوون، بەڵام ئەم پەیماننامانە جێبەجێنەکران کاتێك بە تەواوی هێرش بۆ سەر قوستەنتینیە دەستی پێکرد، هێز لەو شارانەوە هاتن و بەشدارییان لە بەرگری لە شارەکە کرد.

لەم کاتانە ئیمپڕاتۆری بیزەنتی بە هەموو ڕێگەیەك هەوڵیدا سوڵتان لە جێبەجێکردنی ئامانجەکەی ڕابگرێت، بەڵام سوودی نەبوو، پاشان هانای بردە بەر دەوڵەت و شارە ئەوروپییەکان و لەسەروویانەوە پاپای سەرکردەی مەزهەبی کاسۆلیکی، لە کاتێکدا قوستەنتینیە لەسەر مەزهەبی ئەرسەدۆکسی بوون و دوژمنایەتییەکی گەورە لە نێوانیاندا هەبوو، بەڵام ئیمپڕاتۆری بیزەنتی ناچار بوو بەدەوری پاپادا بێت و ئامادەیی دەرببڕیت بە یەکخستنی هەردوو کەنیسەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، لە کاتێکدا ئەرسەدۆکس حەزیان بەوە نەدەکرد، لەبەر ئەوە خەڵکەکە توڕەبوون و هەستان بە بزووتنەوەی دژ بەم کرداری ئیمپراتۆرییە کاسۆلیکیە هاوبەشە لەناو قوستەنتینیە.

دوای ئەم هەموو ئامادەکارییە، سوڵتان هەوڵیدا هۆکارێکی دەستبکەوێت، تا دەرگای جەنگ بکاتەوە، کاتێك دژایەتی سەربازە عوسمانییەکان لە هەندێك گوندەکانی ڕۆم کرا، و چەند کەسێك لە هەردوو لا کوژران، ئەمە هۆکار بوو بۆ فاتیح، تا دەست پێ بکات، کاتێك سوپا و

چەك و سەربازەكان لە ئەردەنەوە بۆ نزیك قوستەنتینیە جولێنران و سەربازە عوسمانییەكان، كە محەمەد فاتیح خۆی سەركردایەتی دەكردن، لە ٦ی نیسانی ١٤٥٣زدا گەیشتنە قوستەنتینیە، هەموو سەربازەكانی كۆكردەوە كە نزیكەی ٢٥٠،٠٠٠ سەرباز بوون، وتارێكی بەهێزی بۆ خوێندنەوە كە گیانی جیهاد وسەركەوتنی تیا جولاندن و قوربانیدان و ڕاستگۆیی لە شەڕدا بە بیر هێنانەوە و ئەو ئایەتانەی قورئانی بۆ خوێندنەوە، كە باس لەوانە دەكات، هەروەك فەرموودەكەی پێغەمبەر (د.خ)ی بە بیر هێنانەوە كە مژدە بە فەتحی قوستنتینیە و فەزڵی سوپا و ئەمیری ئەو فەتحە دەكات، كە ئەوەی فەتحی دەكات لە شكۆی ئیسلام و موسڵمانانە.

بەم شێوەیە سوڵتان لە وشكانی و دەریاوە گەمارۆی قوستەنتینیەی دا ١٤ تۆپخانەی لە چواردەورەی دامەزراند، لەم كاتانەدا گۆڕی (ئەبوئەیوبی ئەنساڕی) دۆزرایەوە، كە شەهیدكرابوو كاتێك گەمارۆی قوستەنتینیەیاندا لەسەردەمی خەلافەتی ئەمەوی ساڵی ٥٢ك.

لەم كاتانەدا بیزەنتییەكان هەستان بە داخستنی مینای قوستەنتینیە، بە زنجیرەی ئاسنین، تاكو نەك هەر ڕێگە لە كەشتیە عوسمانییەكان بگرێت بەڵكوو هەر كەشتیەك هەوڵی نزیكبوونەوەی دابێت، تێكی شكاندووە، پاشان بیرۆكەیەكی سەیر بە مێشكی سوڵتاندا هات، كە كەشتییەكان لە وشكانییەوە بگوێزێتەوە تا ئەو زنجیرە ئاسنینانەی ڕێیان لێگرتووە تێپەڕێنێت، لەگەڵ سەیری ئەم ئیشەدا بە چەند سەعاتێكی كەم

جێبەجێکرا، نزیکەی ٧٠ کەشتیان گواستەوە، کاتێك بیزەنتییەکان ئاگایان لە خۆیان نەبوو.

کاتێك لە ٢٢ی نیسان خەڵکی شارەکە بەیانی بەخەبەر دێن، دەبینن کەشتییە عوسمانییەکان دەستیان بەسەر ڕێڕەوە ئاوییەکەدا گرتووە، وهیچ ڕێگرێك لە نێوان تۆپخانەکانی بیزەنتییەکان و سەربازە عوسمانییەکان نەبوو، یەکێك لە مێژوونووسە بیزەنتییەکان بەسەرسوڕمانی باسی ئەم ئیشە دەکات و دەڵێت (لەمەوپێش نەبینیومانە و نە بیستومانە شتێکی ئاوا دەگمەن، محەمەد فاتیح زەوی ئەگۆڕیت بۆ دەریاکان وکەشتییەکانی ئەگوێزێتەوە لەسەر لوتکەی شاخەکان لەجیاتی شەپۆلەکان، محەمەد فاتیح بەم ئیشە ئەسکەندەری گەورەی تێپەڕاند)، لەگەڵ ئەوەی گەمارۆدراوەکان ئەیانزانی عوسمانییەکان بەسەریاندا سەردەکەون، بەڵام ورەیان لە بەرگریکردن بەرنەدا، لە ٢٣ی ئایاری ١٤٥٣زدا فاتیح پەیامێکی بۆ ئیمپڕاتۆری قوستەنتین نارد، کە خۆی بە دەستەوە بدات و خوێن نەڕێژرێت، بەڵێنی پاراستنی ژیانی خۆی وخێزانی و لایەنگرانی پێدا و لە وەڵامدا ئیمپڕاتۆر دەنووسێت، کە ئامادەیە جزیە بدات بەڵام قوستەنتینیە بەرگری لێدەکات تا دوا هەناسەی یان دەسەڵاتەکەی بپارێزێت یان لەژێر دیوارەکانیا ئەنێژرێت، کاتێك پەیامەکە گەیشت بە فاتیح وتی:زۆر باشە، بەم نزیکانە یان لە قوستەنتینیە دەسەڵاتم دەبێت یا گۆڕم دەبێت تیایدا.

لە کاتژمێر ١ی بەیانی ڕۆژی ٢٩ی ئایاری ١٤٥٣ هێرشێکی گشتییان بۆ سەر شارەکە دەستپێکرد و (سەد و پەنجا هەزار) سەرباز هێرشیان برد

و به دیوارەکانیدا سەرکەوتن، وردە وردە شارەکەیان گرت، تا بەتەواوی دەستیان بەسەر هەموویدا گرت، دوای ٥٣ ڕۆژ گەمارۆدان، ئیمپڕاتۆری قوستەنتین وەك ئەوەی بەڵێنی دابوو، لە بەرگریکردندا کوژرا و سوڵتان ڕۆیشتە شارەکەوە کاتێك نزیکەی نیوەڕۆ بوو و بینی سەربازەکان سەرگەرمی تاڵان وبردنن، فەرمانی دەرکرد بە قەدەغەکردنی هەر دەستدرێژییەك و داوای لە مەسیحیەکان کرد بگەڕێنەوە ماڵ وحاڵی خۆیان و زۆربەی ئەو مەسیحیانەی خۆیان شاردبۆوە، کاتێك لێخۆشبوونی سوڵتانیان بینی، دەرچوون وموڵمانبوونی خۆیان ڕاگەیاند، پاشان فاتیح فەرمانی کرد بەوەی لە کەنیسەی ئایا سۆفیا بانگ بدرێت بەم هەنگاوەش کەنیسەکەی کرد بە مزگەوت، سەربەستی ئایینی بە مەسیحیەکان بەخشی، لە بەجێهێنانی دروشمە ئاینیەکانیان و هەڵبژاردنی سەرەکانیان، هەروەك هەمان حەقی بەخشی بە مەسیحیەکانی هەرێمەکانی تر، بەڵام لە هەمان کاتدا جزیەی لەسەر دانان، نیوەی کەنیسەی شارەکەی بۆ هێشتنەوە ونیوەکەیتری گۆڕی بۆ مزگەوتی موسوڵمانان، و کاتیك شارەکە بە تەواوی فەتح کرا سوڵتان ناوەندی خەلافەتی گواستەوە بۆی و ناوەکەی گۆڕی بە "ئیسلامبۆڵ" یان تەختی ئیسلام یان شاری ئیسلام.دوای تەواوبونی سەرکەوتن و فەتح سوڵتان ناونرا بە فاتیح و فەرمانی کرد بە بەندکردنی سەدری ئەعزەم (خەلیل جەندرلی پاشا) کە تۆمەتبار کرا بەوەی لە بەرامبەری بەرتیل ) ڕەشوە)دا، جوڵانەکانی عوسمانییەکانی بە دوژمن وتووە لە کاتی گەمارۆی قوستەنتینیەدا و دوای ٤٠ ڕۆژ بەندکردن لە سێدارەیاندا.




**نەخشەی فەتحی (قوستەنتینیە )**

## ١٣,٢ .:گرنگیدانی بە خوێندنگە، پەیمانگەکان، بیناسازی و نەخۆشخانەکان

سوڵتان زۆر زانست و زانایانی خۆش دەویستن، لەبەرئەوە گرنگیدا بە کردنەوەی فێرگە و پەیمانگەکان لە هەموو لایەکی دەوڵەتەکەیدا، لەم ڕووەوە پێش باپیرەکانی کەوت و هەوڵێکی زۆری دا لە پێناو بڵاوکردنەوەی زانست و دامەزراندنی خولی فێربوون و چاکسازی تێدا ئەنجامدان، هەستا بە ڕێکخستنی ئەو فێرگانە و دانانیان بەپێی پلە و قۆناغ، پرۆگرامی بۆ دانان و زانستەکانی بۆ هەر قۆناغێك دیاری کرد، سیستمی تاقیکردنەوەی وردی بۆ دانان هەروەك ئامادەی تاقیکردنەوەکان دەبوو و سەردانی فێرگەکانی کردووە و گوێی لە وانەکان گرتووە،

خوێندنی لە هەموو فێرگەکان کرد بە بێ بەرانبەر، ئەو بابەتانەی دەخوێنران تەفسیر و فەرموودە و فیقهـ و ئەدەب و ڕەوانبێژی و زانستی زمان و ئەندازە بوون، هەروەها لە زانایان نزیك بوو، ڕێزێکی بێپایانی لێگرتوون.

زمانی یۆنانی و شەش زمانیتری دەزانی، کاتێك لە تەمەنی ٢١ ساڵیدا بوو، یان لەو ساڵەی کە فەتحی قوستەنتینیەی کر و فەرمانی کرد بە وەرگێڕانی زۆربەی دانراوە یۆنانی و لاتینی و عەرەبی و فارسییەکان بۆ زمانی تورکیی. هانی بزووتنەوەی وەرگێڕانی دا.

فاتیح هۆگر بوو بە بنیاتنانی مزگەوت و کۆشك و نەخۆشخانەکان و خانە و بازاڕی گەورە و باخچە گشتییەکان و ئاوی بردە ناو شارەکانەوە، هانی وەزیر و گەورە پیاوانی دەوڵەت و دەوڵەمەندەکانی دەدا بۆ کردنەوەی، دوکان و بنیاتنانی بینا، کە دیمەنێکی جوانی بە شارەکان ئەدا، و گرنگییەکی تایبەتی دا بە شاری (ئیسلامبوڵ) (ئەستەنبوڵی) ئێستا و سوور بوو لەسەر ئەوەی بیکات بە جوانترین پایتەختەکانی جیهان. دیارترین ئاسەوارە بیناسازییەکانی سوڵتان کۆشکی بابی عالی بوو کە فەرمانی بە کردنەوەی کرد لە سەدەی پانزەدا، لەگەڵ ئەو مزگەوتەی هەر بەناوی خۆیەوە ناونراوە و ئایا سۆفیای لە کەنیسەوە بۆ مزگەوت گۆڕی.

سوڵتان محمەد فاتیح گرنگیدا بە بازرگانی و پیشەسازی، و ئیشی کرد لەسەر بوژاندنەوەیان بە هەموو هۆکار و کردارەکان، عوسمانییەکان زانیارییەکی فراوانیان لەسەر بازاڕە جیهانییەکان هەبوو و ڕێگە دەریایی و

وشکانییەکان و ڕێگە کۆنەکانیان پێش خست و پردی نوێیان دامەزراند تا جوڵەی بازرگانی لە هەموو بەشەکانی دەوڵەتەکەدا ئاسان بکات، و دەوڵەت دراوە زێڕینە تایبەتەکەی خۆی هەبوو، هەروەها بنیاتنانی کارگەی ئازوقە و چەك برەوی پێدرا وقەلآیان لەو شوێنانەی گرنگیەکی سەربازی زۆریان هەبوو لە وڵاتدا دروستکرد.

سوڵتان محمەد فاتیح ئیشی کرد لەسەر بەرەو پێشبردنی دەوڵەتەکەی، لە بەرئەوە چەند یاسایەکی بۆ بەڕێوەبردن دانا، کە لە شەریعەتی ئیسلامیەوە وەرگیرابوون، ولیژنەیەکی لە زانا هەڵبژێردراوەکان پێکهێنا، بۆ سەرپەرشتی کردن وکردوونی بە بنەمایەك بۆ دەوڵەتەکەی.

سەردەمی سوڵتان محمەد فاتیح هاوشان لەگەڵ بەهێزی سوپاکەی و زۆری سوپاکەی ناسراوە بە کردنەوەی خوولی پیشەسازی سەربازی بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی سوپا.

دامەزراندنی دادپەروەری لە ئەرکەکانی سوڵتانە عوسمانییەکان بوو، ئەمەیش هەروەك باوانەکانی پێش خۆی سوور بوو لەسەر جێبەجێکردنی دادپەروەری لە دەوڵەتەکەی، بۆئەوەی دڵنیا بێت لەمە، لە کاتێکەوە بۆ کاتێکیتر پیاوە ئاینییە مەسیحییەکانی دەنارد تا لە هەموو لایەکی دەوڵەتدا بگەڕێن و ڕاپۆرتێکی لەسەر کاروباری دەوڵەت بۆ بنووسن و چۆنیەتی جێبەجێکردنی داد لەناو خەڵکدا، هەروەها هەموو سەربەستییەکی ڕادەربڕینی بەخشی بەو نێردراوانە، هەروەك ڕاپۆرتی ئەو نێردراوە مەسیحیانە هەموو کات دڵنیایی جێبەجێبوونی دادپەروەرییان دەکردەوە بە بێ هیچ جیاوازیەك.

سوڵتان محەمەد لەگەڵ سەرگەرمبوونی بە جیهاد و تێکۆشان، ئاگاداربوو لە هەموو کاروبارێکی دەوڵەتەکەی بەوپەڕی وریایی و زیرەکییەکی زۆر و یادەوەرییەکی بەهێز و لاشەیەکی لێهاتوو، زۆربەی کات بە شەواندا دەچووە سەر ڕێگاکان تا بارودۆخی خەڵك بزانێت وخۆی گوێ لە گلەییەکانیان بگرێت، هەروەك دەزگا زانیارییەکانی دەوڵەت یارمەتیان دەدا تا ئاگاداربێت لە سەر کاروباری دەوڵەت، کە سوڵتان زۆر سوور بوو لەسەرئەوەی هەردەم هەواڵی خەڵکەکەی بزانێت.

## ٢,١٤ : ماوەی مامۆستایەتی مەلا گۆرانی بۆ شازادە محەمەد چەلەبی ( محەمەد فاتیح )

لەو ماوەی گۆرانی لە هەردوو قوتابخانە ئاینییەکانی شاری بۆرسە، وەکو مامۆستا خەریکی گوتنەوەی وانە دەبێت، لەژێر چاودێرییەکی وردی سوڵتان مورادا دەبێت، بۆیە مەلا گۆرانی لەبەردەم تاقیکردنەوەیەکی سەخت دا وانەکانی دەڵێتەوە، بە بێ ئەوەی خۆی هەستی پێکردبێت، بەمەش دەتوانێت لە ماوەی کەمتر لە یەك ساڵ قورسترین ئەرکی پەروەردەیی و زانستی بخرێتە سەر شان لە لایەن سوڵتان موڕادی دووەمەوە، بەوەی وەکو مامۆستای شازادە محەمەد فاتیح دادەمەزرێت، کە ئەویش ڕووداوەکانی ئەم ئەرکە بە چیرۆکێکی سەیر دەست پێ دەکات، بەم شێوەیە:

سوڵتان موڕادی دووەم خاوەنی دوو کوڕ بوو، بەناوەکانی عەلی چەلەبی و محەمەد چەلەبی، علی کوڕی گەورەی سوڵتان بوو، زۆری خۆش دەویست،

وەکو جێنشینی خۆی دیاری کردبوو، لەهەمان کاتدا ئومێدێکی زۆری لەسەر هەڵچنی بوو، بۆیە وردە وردە بۆ سەر تەختی پایەی خەلافەتی ئالی عوسمان ئامادەی دەکرد، عەلی چەلەبی لە لایەن باوکی وەکو والی لە شاری ئەماسییە لە نزیك خۆی دامەزرابوو، بەڵام بەهۆی ئەوەی دووبەرەکی و ملمەلانێی سەخت لە نێو خۆی عوسمانییەکاندا هەبوو، بۆیە لە شەوێکی تاریك پیلانی کوشتنی کوڕەکانی سوڵتان موراد داڕێژرا، بەم شێوەیە، کەسێك بە ناوی (قەرە هزر پاشا) دزەی کردە ناو کۆشکی والی عەلی چەلەبی لە ئەماسییە و توانی لە شیرینی خەودا بیخنکێنێ، بەڵام قەرە هزر دڵی هەر بە کوشتنی عەلی چەلەبی ئاوی نەخواردەوە، بەڵکوو دەستی چووە کوشتنی هەردوو کوڕە شیرە خۆرەکەی عەلی چەلەبی، کە تەمەنیان ١٨ و ٦ مانگی، بە گوێرەی سەرچاوە عوسمانی و ڕۆژئاواییەکان سوڵتان موراد کاتێك هەواڵی تیرۆرکردنی عەلی چەلەبی پێدەگات، بە تەواوی ورەی دەڕووخێت، مەلەلی و نائومێدی لە دوای مردنی کوڕەکەی سەراپای تەمەنی دادەپۆشێت، بۆیە بە گوێرەی یاسای ئالی عوسمانی لە دوای مردنی عەلی چەلەبی محەمەد چەلەبی کوڕی، کە ئەوکاتە لە مانیسیە بوو، لە تەمەنی ١١ ساڵیدا ڕاستەوخۆ دەبێتە جێنشینی باوکی و بە بانگەشەیەکی شاهانە بانگی کۆشك دەکرێت و جێگای عەلی برا گەورەی دەگرێتەوە، تا ئەو کاتە وا دەبینرا کە محەمەد زۆر خوش نودە نەبووە لای باوکی، ئەمەش بەهۆی ئەو کەسایەتیەی فاتیح کە منداڵێکی توڕەو کەللەرەق بوو، تەنانەت بچوکترین ئامۆژگاریشی ڕەتدەکردەوە، بۆیە پەروەردەکردنی محەمەد چەلەبی زۆر قورس بوو، بەڵام بە مردنی عەلی پاشا سوڵتان ناچار بوو بۆ ئەوەی جێنشینێکی باشی لێدەرچێت کەوتە گرینگیدان بە محەمەد چەلەبی.

هەرچەندە ناوی تەواوی مامۆستاکانی محەمەد چەلەبی بەردەست نین، ئەمەش بەهۆی ئەوەی کە پەروەردەکردنی قورس بوو، بۆیە زوو زوو مامۆستاکانی دەگۆڕدران، یەکێك لەو مامۆستایانەی کە ناوی هاتووە، مەلا ئیلیاس ئەفەندی بوو کە وەکو کەسێکی گونجاو نەدەبینرا، چونکە کەسایەتییەکی نەرمی هەبوو، یەکێکی تریش کە پلەی سەدری ئەعزەمی هەبوو، سەرەتا وەکو دیلی شەڕ هاتبووە بۆرسە، هەر لەوێش دەستی کرد بە پیشەی مامۆستایەتی، بەڵام محەمەد چەلەبی هەمیشە وانەکانی ڕەتدەکردەوە،تەنانەت تا ئەو کات قورئانیشی خەتم نەکردبوو،[1] وەکو مێژوونووسی فەرەنسی Franz Babinger دەڵێت:سوڵتان موراد کەوتە ڕاوێژ بە دەوروبەرەکەی، بۆ ئەوەی بتوانێت مامۆستایەکی گونجاو لەو کاتەدا بدۆزێتەوە، ڕاستەوخۆ کەوتە بیری کەسایەتی مەلا گۆرانی بەمەبەستی پێدانی ئەرکی پەروەردەکردنی محەمەدی کوڕی، بۆیە ناردی بە دوای مەلا گۆرانی، ئەوکاتە لە شاری مەزبورە لە قوتابخانەی بایەزید سەرقاڵی گوتنەوەی وانە بوو، کاتێك گۆرانی بۆلای سوڵتان هات، سوڵتان گرفتەکانی کوڕە هەرزەکارەکەی بۆ باس کرد، پێشنیاری پێدانی ئەرکی پەروەردەی محەمەدی بۆ کرد و تا بەڵکو بتوانێ شازادەی یاخی بهێنێتە سەر ڕێ، لەگەڵ ئەوش گۆچانێکی دا بە مەلا گۆرانی و پێی گوت:ئەگەر سەرپێچی فەرمانەکانتی کرد بەکاری بهێنە، گۆرانی بەهۆی ئەوی پیاوێکی باڵا درێژو ڕەنگ سپی و ڕیشێکی پڕ و درێژی هەبوو، خاوەنی هەیبەتێکی سامناك بوو، محەمەدی شازادە ئەوکاتە لە شاری مانیسیە نیشتەجێ

---

[1] Fatih Sultan Mehmed ve Zamanı , çeviren: Dost Körpe , Beşinci baskı: 2003 , İstanbul , s ٤٠

بوو،بەمەش کەوتە بەر دووەم تاقیکردنەوەی کرداری سوڵتان و پێویست بوو توانای خۆی بۆ سوڵتان بسەلمێنێت، گۆرانی بەرەو شوێنی شازادە بەڕێکەوت و چووە ناو کۆشکەکەی، کاتێك شازادەی بینی، مەلا گۆرانی پێی گوت:باوکت بۆ فێرکردنت منی ناردووە، ئەگەر سەرپێچی بکەیت، بەم گۆچانە لێتدەدەم ؟!

محەمەد فاتیح بەو قسەیەی مەلا گۆرانی پێکەنی، وەکو گاڵتە پێهاتنێت، بەڵام ئەوەی محەمەد فاتیح چاوەڕێی نەدەکرد، ڕوویدا، و مەلا گۆرانی بەو گۆچانەی سوڵتان پێی دابوو، هەر لەو کۆڕە و لە بەردەم هەموو ئامادەبوان زۆر بەهێز کێشای بە محەمەد فاتیح.

شازادە محەمەد بە جۆرێك ترسی لێنیشت، تا مردن نەیتوانی ئازاری ئەو گۆچانەی لە بیر بچێتەوە، بۆیە لە ترسان دەستی کرد بە خوێندنی وانەکانی و لە کەمترین ماوەدا توانی هەموو قورئانی پیرۆز خەتم بکات[1].

بەڵام ئەوەی جێی سەرنج و تێڕامانە، زۆربەی یاخود هەموو سەرچاوە تورکییەکانی هاوچەرخ، تەنانەت دکتۆراکەی یڵدزیش، باسی پیاکێشانەکەی مەلا گۆرانی لە فاتیح دەپچڕێنن و باسی ناکەن، تاکە هۆکاری ئەمەش ئەوەیە، کە نایانەوێت لە پێگە و کەسایەتی پیاوێکی کاریزماتیکی وەکو محەمەد فاتیح کەم بکەنەوە، چونکە لایان وایە لێدان و تەئدیب کردن کەمی و نەگیە بۆ سوڵتانێکی عوسمانی، لە کاتێکدا ئەم باسە زۆر بەڕوونی لە (الشقائق النعمانية) دا هاتووە.

---

[1] گاشکوبەری زادە ، ص ٥١-٥٢

له بارەی ساڵی دامەزراندنی مەلا گۆرانی وەکو مامۆستای شازادە محەمەد، سەرچاوەکان ئاماژەیان بە مێژووەکەی نەکردوە، هەروەها سەبارەت بە تەمەنی محەمەد فاتیح ئەو کاتەی وانەی لە لا خوێندووە کۆدەنگییەکی ئەوتۆی لەسەر نییە، بەڵام بە گوێرەی هەندێ لە سەرچاوەکان ساڵی ١٤٤٣ ز –٨٤٧ ك، بەو ساڵە دەستنیشانکراوە، واتە محەمەد فاتیح ١١ ساڵان بووە و تەمەنی مەلا گۆرانیش ٣٣ بۆ ٣٤ ساڵ بووە، بە گوێرەی سەرچاوە عوسمانیەکان گۆرانی یەکەم وانەی کە بە محەمەد فاتیحی دابێت، بریتی بووە لە خەتمی قورئان، واتە سەرەتای ئەلفوبێی عەرەبی بە فاتیح داوە، لە سەرەتادا گۆرانی مامەڵەیەکی زۆر ڕەقی لەگەڵ فاتیح کردووە، بەڵام بەهۆی ترسی و گوێڕایەڵی فاتیح گۆرانیش وردە وردە لەگەڵی مامەڵەی نەرم کردۆتەوە، دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی کەم، گۆرانی بە باشی لە دەروونی فاتیح گەیشت، و دەیزانی ئەم منداڵە بێهاوتایە، خاوەنی وزەیەکی لەبن نەهاتووە، توانای وەرگرتنی هەموو زانیارییەکانی هەیە، ئەمە جگە لەڕووی جەستەشەوە خاوەنی لەش و لارێکی ڕێك و جەستەیەکی بەهێزو پتەو بووە.[١]

مەلا گۆرانی مرۆڤێکی کارا و خاوەن میزاجێکی هاوسەنگ بوو، هیچ تەماحێکی لە پلە و پایە دەسەڵات نەبوو، نیعمەتەکانی دونیا لە هەڵسوکەوتەکانی ئەودا، کاریگەری لەسەر نەبووە، هەرگیز ڕاستی و دادپەروەریی لە یەکتر جیانەکردۆتەوە، بە ئەندازەی ئەوەی زانیاری بە

[1] Yıldz , s 53-54

قوتابی دەدا، هێندەش لە ڕووی ڕۆحییەوە پێی دەگەیاند، ئیشی دەکرد لەسەر ئەوەی کە شەخسیەتێکی ڕاست و بەهێز لە فاتیح پەروەردە بکات.[١]

ئەم ڕووداوە ناتوانین هەر وا بە ئاسانی بەسەریدا تێپەڕین، چونکە کەوتنە بیری مەلا گۆرانی لەلایەن سوڵتان موراد و فەرمانکردنی بە دامەزراندنی لەناو کۆشك، هەر لەخۆوە و وا بەئاسانی نەبووە، دەبێت سوڵتان متمانەیەکی زۆری بە گۆرانی هەبووبێت، بەتایبەت دوای ئەو ئەزموونە تاڵەی، کە بینی بووی لە ناپاکی لە دوژمنەکانی لەناو کۆشك.

محەمەد فاتیح بەختێکی باشی هێنا، کە زانایەکی پڕ ئەزموونی وەکو مەلا گۆرانی بوو بە مامۆستای، بەتایبەت کە گۆرانی ژیانی قوتابییەتی لە خزمەت زۆربەی زانا ناودارەکانی ئەو سەردەمە بووە، ئەمە جگە لەوەی پیاوێکی زۆر بە ئەزموون بوو لە بواری زمانەوانی، سەرەڕای زمانی شیرینی زگماکی کوردی، لەگەڵ ئەوەشدا زمانی فارسیی زۆر باش بوو ؟ چونکە سەرەتای فەقێیەتیشی ماوەیەك لە شاری تەبرێز و هەمەدانی سەنتەری زمانی فارسیی بەسەر بردبوو، دوای ئەوەش ماوەیەك لە شاری بەغدا سەرچاوەی زانست و کۆنە پایتەختی عەباسی خوێند بوو، دوای ئەوەش لە ژێر ناوچەی هۆزە تورکمانەکان و شارەکانی باکوری کوردستان وەکو (حەسەن کێف) و (جەزیرەی بۆتان) و (دیاربەکر) تەواوی کردبوو، دواتر ڕووی کردۆتە شام و دواتر قودس و دواتر قاهیرە،ئەمەش وای کرد بە تەواوی لە زمانی عەرەبی قووڵ ببێتەوە. ئەو هەموو ئەزموونە کەڵەکە بووەی مەلا گۆرانی گەنجینەیەکی شاراوە بوو بۆ شازادەیەکی مێردمنداڵی وەکو فاتیح، بۆیە

---

[1] NESÝMÝ YAZICI: Fâtih’in Yetiþmesi Üzerine Bazý Deðerlendirmeler , AÜÝFD XLVIII (2008), sayý I , s 9

توانیبووی هەر لەتەمەنی گەنجیدا،جگە لە زمانی تورکی بەتەواوی زمانەکانی عەرەبی، فارسی، لاتنی و یۆنانی و رۆمی و سربیی فێر ببێت. لە ڕووی زانستەکانی تریش هەریەکە لە زانستی مێژوو، جوگرافیا، هونەری جەنگ، ئەستێرەناسی، بیرکاری، لۆژیك و کیمیای خوێندبوو، هەروەها لە بوارەکانی سۆفیگەری، میوزیك، ڕاوکردن، زۆرانبازی، نیشانەگرتن و وەرزش ئەزموونێکی باشی کۆکردبووەوە.[١]

دەسەڵات پێدانی لێدان لە شازادە، دیسان خاڵێکی گرنگە، بێگومان ئەو سەر کێشیانەی فاتیح لە ئەنجامی نەرمی مامۆستایەکانی و پلە و پایەکانی خۆیەوە بوو، چونکە  تەنانەت بۆ هیچ یەك لە مامۆستاکانیشی نەبوو فەرمان بە شازادە بکەن، چ جای لێدانی !.

ئەم سەرکەوتنەی مەلا گۆرانی بۆ سوڵتان موڕاد، چاوەڕوان نەکراوبوو، بەمەش توانی خەمێکی گەورە لەسەر ئەستۆی سوڵتان لا ببات و بیخاتە سەرشانی خۆی، ئیتر سوڵتان موڕاد توانی بپرژێتەوە سەر کاری دەوڵەتداری. هەر بۆیە دوای بیستنی ئەم سەرکەوتنەی مەلا گۆرانی، سوڵتان زۆر ئاسوودە دەبێت، لەبەرانبەر ئەوەشدا ماڵ و سامانێکی زۆری بۆ دەنێری[2].

لە سەردەمی سوڵتان عەبدحەمیدی دووەم ڕووداوێکی چاوەڕوانەکراو ڕوویدا، ئەویش دۆزینەوەی دەفتەرێکی وێنەیی بوو، کە لە پەرتوکخانەی

[1] Hüseyin Tekinoğlu ; Fetih 1453 Ya İstanbul Beni Alacak Ya Ben İstanbulu , İstanbul 2012 , s 14-15

[2] تقي الدين الغزي : المولى تقي الدين بن عبد القادر التميمي الدّاريّ الغزّيّ المصريّ الحنفيّ المتوفى سنة ١٠٠٥ هـ ، الطبقات السنية في تراجم الحنفية ، المحقق: د. عبد الفتاح محمد الحلو ، جزء الاول ، ٣٢٣

(تۆپ کاپی سەڕای)دا هەڵگیرا بوو، تەنانەت هیچ کەس زانیاری سەرەتایشی دەربارەی ئەم دەفتەرە نەبووە. تا لە ساڵی ١٩٤٠ لە لایەن پرۆفسیۆر (سوهیل ئەنوەر) دەستکرا بە لێکۆڵینەوەی وردی زانستی و بۆ ماوەی ٢١ ساڵ کاری بەردەوامی لەسەر کرا. لە ساڵی ١٩٦١ کارەکە بە کۆتایی هات و ئەنجامەکەی سەرسوڕهێنەر و چاوەڕوان نەکرابوو، لێکۆلێنەوەکە بە ناوی (دەفتەری منداڵی محەمەد فاتیح ) بڵاو کرایەوە، مێژووی وێنە و نووسینەکانی دەفتەرەکە دەگەڕایەوە بۆ سەردەمی سوڵتان موڕادی دووەم و بە خەتی محەمەد فاتیح کێشرا بوو. وێنەکانی ناو دەفتەرەکە بریتی بوو لە وێنەی ئاژەڵانی وەکو کوندە پەپۆ، سەری ئەسپ، حاجی لەق لەق و هەڵۆ. لەگەڵ چەند وێنەی سەری پیاو. هاوکات چەند نووسینێکی بە زمانی عوسمانی وەکو ناوی خودا و لەگەڵ ئەلفوبێی یۆنانی و فارسی نووسیی بوو. لێکۆڵینەوەکە بایەخێکی گرینگی هەبوو، بەڵام ئەوکاتە بۆ ئێمە زیاتر دەبوو بایەخی ئەگەر ئەو سەردەمە منداڵییەی کە محەمەد فاتیح وێنەکانی تیادا کێشا بوو لەگەڵ ناوی مامۆستاکەی ئەوە بێگومان بواری قسە کردنمان لەو بارەیەوە زیاتر دەبوو، لەبەر ئەوە ناتوانین لە ئێستا دا هیچ ڕێگایەك بدۆزینەوە بۆ بەیەکتر بەستنەوەی ڕۆڵی مەلا گۆرانی لە وێنەو نووسینەکانی ناو دەفتەرەکە.

**نموونەیەك لە وێنە نووسینەكانی ناو دەفتەرەكە:**



دوای تێپەڕبوونی یەك ساڵ بەسەر كاری مامۆستایەتی مەلا گۆرانی لەگەڵ محەمەد فاتیح، دەتوانێ فێری زۆر شتی بكات، گۆرانی بە تەواوی فاتیح ئامادە دەكات، لەم ماوەیە هەوڵ و ماندووبوونێكی زۆری لەگەڵدا كێشا، هاوكات سوڵتان موراد لە) ٨٤٨ك ١٤٤٤ (ز بڕیاری وازهێنانی لە تەختی دەسەڵاتدا، محەمەد فاتیحی لە شوێنی خۆی دانا،دوای ئەوەی سوڵتان موڕاد، كە شاهێدی مردنی كوڕ و كوڕەزاكانی بوو، بە سروشتی خۆی پیاوێكی سۆفی بوو، هەمیشە حەزی بە سادەیی و گۆشەگیر دەكرد، بێ ئەندازە پیاوێكی خواناس بوو، زۆربەی كاتەكانی بە عیبادەت بەسەر دەبرد، بۆیە لە خوای دەویست ڕۆژێك شازادە محەمەد زووتر گەورە بێت، تا بیهێنێتە شوێنی خۆی، بۆ ئەم مەبەستە محەمەدی لە مانیسیەوە هێنا

بۆ ئەردنە بەمەستی بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت، هەر چەندە زانیاریمان لەسەر ئەوە نییە کە ئایا مەلا گۆرانی هەر لەگەڵ محەمەد فاتیح هاتووە بۆ ئەردنە یاخود لە مانیسییە ماوەتەوە، یاخود گەڕابێتەوە بۆرسە، بەڵام کاتێك گۆرانی لە مانسییە بوو تەنها کاری پەروەردە کردنی فاتیح بوو، ئێستا فاتیح لە تەختی دەسەڵاتە و ئیتر گۆرانی کارێکی لەو شارە نەمابوو. بەڵام ئێمە نازانین ئەم ماوەیە مەلا گۆرانی لە کوێ نیشتەجێ بووە و سەرقاڵی چی بووە.

کاتێك هەواڵی وازهێنانی سوڵتان موڕاد گەیشت بە ئەوروپییەکان کە ئەو کاتە لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی ڕێکەوتنێکی ١٠ ساڵەیان مۆرکردبوو، بۆیە ئەم هەلەیان قۆستەوە، بۆ ئەوەی منداڵێکی کەم ئەزموونی وەکو محەمەد بقۆزنەوە و بتوانن دەسەڵاتی عوسمانیی بە تەواوی بێ هێز بکەن.بۆ ئەم مەبەستەش هێزێکی زۆریان کۆکردەوە بەرەو سنووری دەسەڵاتی عوسمانی هاتن، لەو کاتدا هەواڵ درایە سوڵتان موڕاد، کە هەر زوو بەپەلە بگاتەوە کۆشك، سوڵتان لە خەڵوەتەکەی دەرچوو و دەستی کرد بە کۆکردنەوەی هێزێکی ٤٠ هەزار سەربازی و لە شەڕێکی سەخت توانی بەسەر هاوپەیمانی مەسیحی زاڵ ببێت و سوڵتانی مەجەڕیش بکوژێت، بەڵام ئەم کارە وا لە موڕاد ناکات کە دەستبەرداری خەڵوەتنشینەکەی ببێت، بۆیە بۆ جاری دووەم واتە لە ساڵی ١٤٥١ ز – ٨٥٥ ك دەسەڵاتی جێهێشت بۆ محەمەدی کوڕی.[1]

---

[1] یلماز اوزتونا : تاریخ الدولة العثمانیة ، ترجمة عدنان محمود ، محمود الانصاری ، مجلد الاول ، استانبول ١٩٨٨ ، ص ١٢٨–١٣٠

## ٢,١٥ :ئەركی مەلا گۆرانی لە ماوەی هاتنە سەر تەختی محەمەد فاتیح:

سوڵتان محەمەدی فاتیح  لە دوای مردنی باوکی لە ١٦ی موحەڕەمی ساڵی ٨٥٥ ك بەرانبەر ١٨ فێبرایەری ١٤٥١ ز دا فەرمانڕەوایەتی دەوڵەتی عوسمانیی گرتە دەست.لەگەڵ هاتنە سەر تەختی سوڵتانی، دەستی كرد بە گۆڕانكاری لە یەكە كارگێریی و سەربازییەكانی نێو دەوڵەت،چاكسازی لە گەشەپێدان و بەڕێوەبردنی هەرێمەكان كرد، هەندێ لە كاربەدەستە پێشینییەكانی لە هەرێمەكانی خۆیاندا هێشتنەوە و ئەوانەی لابردن كە كەم وكورتی، یان كەمتەرخەمییان لێ بە دیار كەوتبوو.

سەرەتا نزیكەكانی خۆی هەر یەكە لە (زاغانۆس پاشا )و (ئیبراهیم پاشا)ی هێنا و دەسەڵاتی بەڕێوەبردن و كارگێڕیی پێدان، دواتر لە پۆستە وەزارییەكانیش پێشنیازی پلەی وەزیری بۆ مەلا گۆرانی كردبوو، چونكە لەمەودوا محەمەد فاتیح تەنها قوتابییەكی گوێڕایەڵی مەلا گۆرانی نییە، بەڵكوو ئێستا ئەو سوڵتانێكی عوسمانییە، تا ئەو كاتەش ٨ ساڵ تێپەڕی كردبوو بەسەر دامەزراندنی مەلا گۆرانی وەكو مامۆستای محەمەد فاتیح، بۆیە توانی بووی بە باشی مەلا گۆرانی بناسێت، تا گەورە تر دەبوو، زیرەكیی و بلیمەتیی ئەوی زیاتر بۆ دەردەكەوت، نەیدەتوانی لەژێر چاودێری و ڕاوێژی مامۆستاكەی دووربكەوێتەوە بەردەوام هەستی دەكرد كە پێویستی بە زیرەكیی و ئەزموونی ئەم مامۆستا گەنجەی هەیە، هەر لەگەڵ یەكەم ڕۆژانی هاتنە سەر كاری، پێشنیازی پێدانی پۆستی وەزیری بۆ كرد، بەڵام گۆرانی سەرەڕای ئەوەی كەسێكی دیندار بوو، زۆر حەزی بە

ماڵ و سامان و پلەو پایە نەدەکرد، لە هەمان کاتیشدا پیاوێکی ورد بین بوو، نەیدەویست خۆی تووشی ململانێیەکی تر بکات لەگەڵ پیاوانی دەوروبەری سوڵتان، وای دەبینی جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوان سەردەمی قاهیرە و ئەردنە لە ڕووی دەسەڵاتی سیاسی نییە، پیاوەکانی دەوروبەری محەمەد فاتیح هەمان پیاوی دەوروبەری زاهیر چەقماقن، زامی بوهتانەکەی قاهیرە زۆر لەسەر دڵی گران بوو، هەر بۆیە هەمیشە خۆی لە ملمەلانێی پیاوانی دەوروبەری سوڵتان دەپاراست، نەشیتوانی بە ڕەهایی تەکلیفەکەی سوڵتان ڕەت بکاتەوە، بۆیە بە شێوەیەکی زۆر دیبلۆماسی و ژیرانە خۆی ڕزگار دەکات و دەڵێت:سوڵتانم لە دەرگای تۆدا خزمەتکار و کۆیلەیەکی زۆر هەن، ئەوان لە ئێستادا خزمەتی تۆ دەکەن، بە ئومێدی ئەوەی لە داهاتوو پۆستی وەزیریان پێ بدەیت، هەر بۆیە ئەگەر پلەی وەزیر بە خەڵکی تر بدەی (گۆرانی مەبەستی خۆی بوو )، جگە لە خۆیان نەبێت، ئەوە ئەوکات دڵیان لە تۆ وەردەگەڕێت و تووڕە دەبن و کاروباری دەسەڵاتت تێکدەچێت[1] .

فاتیح بە وەڵامەکەی مەلا گۆرانی زۆر سەرسام دەبێت، زانی ئامۆژگاری مامۆستاکەی لە جێگای خۆیەتی، بۆیە گوێڕایەڵی کرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەیدەویست مەلا گۆرانی تەنها بە پیشەی مامۆستایەتیی خەریك بێت، بەڵکوو دەیویست لە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات ڕۆڵی پێبدات، هەر بۆیە ئەمجارە پێشنیازی پۆستی دادوەریی سەربازی گشتی بۆ مەلا گۆرانی خستە ڕوو و ئەویش قبوڵی کرد، کە ئەم پۆستەش لە سەردەمی

---

[1] التميمي الداري : ص ٣٢٣-٣٢٤ . گاشکبری زاده : ص ٥٢ . Amet ATEŞ ; S 249

عوسمانییەکان بەرزترین پایە بووە لە پێکهاتەی دادوەریدا، لە ڕووی پلەوە یەکسان بووە بە پایەی وەزیر. لە ڕووی سەربازییەوە ڕۆڵی یەکلاکردنەوەی داوا شەریعی و یاساییەکانی کردووە. لە ڕووی خزمەتە زانستییەکان و مامۆستایەتی پاشا و شازادەکان و لێکدانەوەی ئەحکامی شەرعی لە کۆتاییدا دەگەڕایەوە بۆ دەسەڵاتی دادوەری گشتی، ئەمەش لە هەمان کاتدا مانای موفتییەتی دەگەیەنێت.

یەکێکیتر لە دەسەڵاتەکانی گۆرانی ئەوە بووە،کە لە کاتی دەرچوونی سوپا،ئەم شان بە شانی سوڵتان و سەرکردە جەنگییەکان و وەزیرکان بەشداری دەکرد، هەروەها لە کاروباری دەوڵەتدا ڕاوێژکاری یاسایی سوڵتان بوو، کە دواجار سەرپەرشتی دابەشکردنی دەستکەوتەکانی جەنگی دەکرد، ڕۆڵی دادوەرییشی دەبینی لەو سکاڵایانەی کە لە نێوان خەڵك بەرز دەکرانەوە، وە دامەزراندنی سەنتەر و دادوەری و ناوەندەکان و پشکنین و لابردنیان لە دەسەڵاتی مەلا گۆرانیدا بوو [١].

هەرچەندە ئەو پایە نوێیەی نەبووە هۆی ئەوەی، کە مەلا گۆرانی لە پیشەی مامۆستایەتییەکەی دوور بخاتەوە، بەڵکوو ڕۆژانە لەگەڵ کاری دادوەرییدا خەریکی وتنەوەی وانەکانیشی دەبێت.

---

[1] Yızdız ; s٦١-٦٠

## ٢. ١٦:گۆڕینی مەزهەبی مەلا گۆرانی لە شافیعییەوە بۆ حەنەفی:

تا ئەو شوێنەی ئێمە زانیاری مێژووییمان هەبێت، مەلا گۆرانی یەکەم مەلای کوردە، کە مەزهەبی خۆی لە شافیعییەوە گۆڕی بێت بۆ حەنەفی، لە سەرەتادا مەلا گۆرانی بە سروشتی خۆی لە ناوچەیەکی تێکەڵی کۆمەڵێك بیروباوەڕ و مەزهەبی جیاواز لەدایکببوو، بۆ نموونە بوونی هەندێ شیعە لە خواروو و ڕۆژهەلاتی میسۆپۆتامیا و لە هەمان کاتدا بوونی ئێزدییەکان و مەسیحی وجوولەکەکان لە موسڵ و دەوروبەری، ئەمە جگە لە بوونی هەردوو مەزهەبی شافیعی و حەنەفی، ئەم واقیعە جوگرافییە لە لایەك و گەڕانی بە بەردەوامی بۆ شار و وڵاتان، تەنانەت کیشوەرەکان وایان لە مەلا گۆرانی کرد بوو، کە مامەڵە لەگەڵ هەموو ئەم بیر و باوەڕانە بکات وشارەزاییان لە بارەیەوە پەیدا بکات، چونکە مەلا گۆرانی لە بنەماڵەیەکی بە ئایین موسوڵمان و بە مەزهەب سونەی شافیعی لەدایکببوو، هەر بۆیە ئەم بیروباوەڕەی بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی وەرگرتبوو، لەگەڵ ئەوەشدا پرسیارێك دروست دەبێت، کە ئایا بۆچی مەلا گۆرانی مەزهەبی خۆی گۆڕیوە ؟

کێشەی کەمی سەرچاوەکان دیسان بەهانەیەکی ترە، بۆ ئەوەی نەتوانین وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە، ئەگەر بۆچوونەکەی (ساقیب یلّدز) نەبووایە، ئەوە بێگومان ئێمەش خۆمان لەو پرسیارە دەبووارد، بەڵام بۆچوونەکەی ساقیب وامان لێدەکات کە گەڕانێکی وورد بکەین بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە، چونکە (ساقیب یلّدز) لای وایە کە مەلا گۆرانی بە شێوەیەکی خۆنەویستانە و جۆرێك لە فەرمان مەزهەبی خۆی گۆڕی بێت،

وەك دەڵێت:لە سەرچاوە عوسمانییەکان هیچ زانیاریمان نییە، کە مەلا گۆرانی کەی مەزهەبی خۆی گۆڕی بێت، بەڵام وەکو گریمانە وا دادەنرێت، کە مەلا گۆرانی دوای هاتنی بۆ ئەنەدۆڵ و لەسەر داوای سوڵتان موڕادی دووەم، مەلا گۆرانی مەزهەبی خۆی لە شافیعەوە گۆڕی بێت بۆ مەزهەبی حەنەفی، هەرچەندە ساڵی ئەم کارە دیاری نەکراوە بەڵام ئێمە بە گریمانە ساڵی ٨٤٧ ك –١٤٤٣ ز وەردەگرین [1].

دواتر کەمێك لە سەرچاوەکانی ئەم بۆچوونەی یلدز وردبووینەوە، بەو شێوەیە هەموو ئەو سەرچاوانەی کە ئاماژە بەم بابەتە دەکەن، بریتییە لە کتێبەکەی موستەکەیم زادە (الدوعه و المشاهید) کە لەساڵی ١٧٨٨ ز وەفاتی کردووە، وەکو لە خوارەوە خراوەتەوە ڕوو، لە پەراوێزی لای ڕاستی پەرتووکەکەی ئاماژەی بۆ کردووە، کە ئەمەش جێگای سەرنجە، کە ئاخۆ بۆچی نووسەر ئەم بابەتەی نەخستۆتە کرۆکی بابەتەکە !!؟؟ دیارە موستەقیم زادە ئاماژەی بەوە کردوە کە ئەم زانیارییەی لە زانای خواناس کاتیب چەلەبی ١٦٥٧ ز و پەرتووکی (سولەمو الوصول) وەریگرتووە،کە تا ئەمرۆش ئەم پەرتووکە چاپ نەکراوە، تا ئێرە سەرچاوەی زانیارییەکە دیارە، بەڵام ئیتر ئێمە نازانین (کاتب چەلەبی )ئەم قسەی لە کام سەرچاوە وەرگرتووە.

---

[1] YILDZ : S ٥٢

دەکرێت لە چەند لایەکەوە ئەم بۆچوونەی (یلدز) هەڵسەنگاندنی بۆ بکرێت، سەرەتا هەموو ئەو سەرچاوە ڕەسەنانەی لەبارەی مەلا گۆرانی دواون، تەنها ئاماژە بەوە دەکەن، کە مەلا گۆرانی سەرەتا مەزهەبی شافیعی بووە و دواتر مەزهەبی خۆی بۆ حەنەفی گۆڕیوە، واتە هیچ سەرچاوەیەك ئاماژەی بەوە نەکردوە، کە ئاخۆ لەسەر داوای سوڵتان

بووه، یان بە شێوەیەکی باوەڕی بووە. بەڵام دەبێت ئەوە بزانین، کە ئەو خاڵەی مەلا گۆرانی لە زاناکانی سەردەمی خۆی جیا کردۆتەوە، ئەویش بوێری و چاونەترسیەکەی بووە، چونکە دواتر دێینە سەر باسی ئەوەی، کە مەلا گۆرانی لە کاتێکدا لەوپەڕی بەرپرسیاریەتی دەبێت، چۆن نامەی محەمەد فاتیح دەدڕێنێت، کەمترین تێگیرانی شەرعی تیادا دەبینیٚ، لەسەر ئەمە تەنانەت نەك لە پۆستەکەی دوورکەتەوە، بەڵکوو مەرکەزی عوسمانیشی بەجێهێشتووە، بەدڵنیاییەوە ئەگەر باوەڕی بەو گۆڕینە نەبووبێت، ئەوە گوێڕایەڵی سوڵتانی نەدەکرد، ئەمە سەرەڕای ئەوەی سروشتی سوڵتانیش لەم جۆرە کارانە دوور بووە، چونکە وەکو سەرچاوە عوسمانییەکان پێمان دەڵێن، کە موڕادی دووەم باشترین پیاوی سەردەمی خۆی بوو، لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا بەهۆی ئەم هەموو دانایی و ورەبەرزیی و بێباکی و بەخشندەیی و ئازایەتی و پلە بەرزییەی کە هەیبوو، تەمەنی لە جیهادی ڕێی خوا دا بەسەر برد، پیاوێکی سەر ڕاست و ئیماندار بوو، هەمیشە حەزی بە خەڵوەت و دوورکەوتنەوە لە ناز و نیعمەتەکانی دونیا دەکرد، شاعیر و زانایانی زۆرخۆشدەویستن، هەمیشە ڕێزی بۆیان دادەنا، بۆیە کاتێك لە تەمەنی ٤٨ساڵیدا وەفات دەکات، وەسیەتی ئەم ئەوەیە، کە لە نزیك مزگەوتی موڕادیە لەبورسەبە خاکی بسپێرن، گۆرەکەی بە سادەیی و بەبیٚ ڕازاندەنەوە و تەنها چەند نشینەگەیەك بۆ قورئان خوێنان لە دەوری گۆڕەکەی درووست بکەن.

ئەمە ڕەوشتە بەرزەکانی ئەم سوڵتانە بوو، ئایا دەگونجێت داخوازییەکی واهای لە مەلا گۆرانی کردبێت، لە کاتێکدا غەیرە ئایینەکانی

پلەوپایەیان هەبوو، ئایا ئەم دەوڵەتە جێگەی پیاوێکی شافیعی مەزهەبی بێ پلەوپایەو پۆستی تیادا نەبۆتەوە !؟ لەگەڵ ئەوەشدا دەگونجێت سوڵتان موراد گۆڕینی مەزهەبی وەکو پێشنیاز بۆ مەلا گۆرانی کردبێت.

بەڵام لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە، ئەی بۆچی مەلا گۆرانی مەزهەبەکەی خۆی گۆڕی ؟ لە راستیدا وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە پەیوەستە بەو ژینگە کە مەلا گۆرانی تیادا گەورە بووە، مەلا گۆرانی تا تەمەنی ١٥ساڵی لە ناوچەکانی خۆیدا،وانە سەرەتاییەکانی لە لای مامۆستا شافیعیەکانی وەکو زین دین قەزوینی خوێندبوو، بەڵام لەو کاتەی کە پێدەخاتە ناو خاکی شام ئیتر زۆربەی ئەو مامۆستایانەی کە وانەی لەلا خوێندوون،حەنەفی مەزهەب بوون، کە لە بەشەکانی سەرەتا گەیشتین بەو ئەنجامەی یەکەم مامۆستای لە دیمەشق بریتی بوو لە عەلائەددین بوخاری، ئەم زانایە بە مەزهەب حەنەفی بوو، کاریگەرییەکی زۆری بەسەر گۆرانییەوە هەبووە، دواتر زۆربەی مامۆستاکانی لە قاهیرە بریتی بوون لە زانا مەزهەب حەنەفییەکان، تەنانەت بە مەزهەبی رەسمی دەوڵەتی مەمالیکەکانیش، مەلا گۆرانی جگە لە پیادەکردنی مەزهەبی حەنەفی لە نێوان دوو دەوڵەتی مەمالیك و عوسمانییەکان،هەر بۆیە لە دوای توێژینەوە و دووربینییێکی زۆر، گەیشت بەو ئەنجامەی کە مەزهەبی حەنەفی زیاتر گونجاو و واقیع بینانەترە،بە بەراورد لەگەڵ مەزهەبی شافیعی، بە تایبەتی لە بابەتی حوکمی سیاسەت و قەزاوەت، دەوڵەتداری و بابەتی نەسەبی خەلیفە..... هتد.

نابێت ئەوە لە یاد بکەین، کە ئەو ستەمەی لەلایەن بە ناو حەنەفی مەزهەبەکانی میسر و ڕووداوەکەی لەگەڵ حەمیدەدین، وای لە مەلا گۆرانی نەکرد، کە ببێت بە پیاوێکی دەمارگیر لە دژی مەزهەبی حەنەفی.

سەبارەت بە ساڵی گۆڕینی مەزهەبی گۆرانیش، ئەوە دیسان سەرچاوەکان هیچمان پێنالێن، بەڵام شتێکی سروشتییە لێرەشدا جارێکیتر لەگەڵ بۆچوونەکەی (ساکیب یلدز) جیاواز بین،لە حالێکدا دەکەوینە نێوان ئەو دوو هەڵبژاردەیەی، کە ئایا گۆرانی لەسەردەمی موڕادی باوکی فاتیح مەزهەبی خۆی گۆڕییوە ؟ یاخود لە سەردەمی محەمەد فاتیحدا؟ چونکە ئەگەر توانیمان ئەوە بسەلمێنین، کە گۆرانی لەسەردەمی سوڵتان محەمەد فاتیح مەزهەبی خۆی گۆڕیوە، ئەوە لەو حاڵەتەدا سەر لە بەری بۆچوونەکەی بەڕێز یلدز هەڵدەوەشێتەوە، لە بارەی گۆڕینی مەزهەبی گۆرانی بە شێوەیەکی ناچاری، ئەو سەرچاوانە، کە باسی گۆڕینی مەزهەبی مەلا گۆرانی دەکەن، بریتین لە شەوکانی و سەخاوی، کە ئەوەیش بەم شێوەیە هاتووە، دوای وەفاتی سوڵتان موڕاد، محەمەد فاتیحی کوڕی جێگای دەگرێتەوە، پیشنیازی پلەی وەزیر بۆ مەلا گۆرانی دەکات، بەڵام ئەو رەتی دەکاتەوە بە هۆی ئەو هۆکارەی باسمان کرد، دواتر محەمەد فاتیح هەر سوور دەبێت لە سەر ئەوەی کە گۆرانی رۆڵ ببینێت لە ماوەی فەرمانڕەوایی ئەو، بۆیە ئەم جارە پێشنیازی دادوەری گشتی بۆ دەکات ئەویش قبووڵی دەکات و ئینجا مەزهەبی خۆی دەگۆڕێت بۆ حەنەفی[1]. واتە بە گوێرەی ئەم گێڕانەوەی سەروە بێت ئەوە

[1] الشوكاني : ص ٤١ . السخاوي : ص ٢٤٢ .

مەلا گۆرانی لە ساڵی ١٤٥١ ز ٨٥٥ ك و لەگەڵ هاتنە سەر تەختی فاتیح مەزهەبی خۆی گۆڕیوە، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە تا ڕۆژانی هاتنە سەرتەختی محەمەد فاتیح گۆرانی هیچ پلەوپایەیەکی لە دەوڵەتدا نەبوو، بەڵام کاتێك پۆستی دادوەری گشتی سەربازیی قبووڵ دەکات، ئەوە ئەوکات گۆرانی بەهۆی ئەوەی کە بنەمای یاساکانی دەوڵەتی عوسمانیی لەسەر مەزهەبی حەنەفی داڕێژا بوو، ناچارە کار بەو یاسانە بکات، بۆیە دەگونجێت بەو هۆکارە مەزهەبی خۆی گۆڕی بێت.

## ٢. ١٧:ڕۆڵی مەلا گۆرانی لە ئازادکرنی قوستەنتینیە (فەتحی ئەستنەنبوڵ)

مەلا گۆرانی بە سیفەتی ئەوەی کە پایەی دادورەی گشتی سوپای هەبوو، بۆیە بەشداری کاراشی لە فەتحی ئەستەنبوڵدا کرد، شان بەشانی خودی سوڵتان، دادوەر و زاناکان، وتاربێژەکانی جەنگ، پیاوانی سەربازی و وەزیرکان. بەڵام بەر لەوەی باس لە ڕۆڵی مەلا گۆرانی لە فەتحەکە بکەین، ئەوا پێویستە گوزەرێکی خێرا بە هەوڵە مێژووییەکانی فەتحی قوستەنتینیە بکەین.

## ٢ ,١٨ :چیرۆکی فەتحی ئیستەنبول:

دامەزراندن و بونیاتنانی ئەم شارە، بۆ سەردەمی قوستەنتینی یەکەم (٣٢٤–٣٣٧)ز لە ساڵی ٣٣٠ ز دەگەڕێتەوە، ئەم شارەی کرد بە پایتەختی بێزەنتییەکانی ڕۆژهەڵات، توانی پێکهاتەی بونیاتی شارێکی گەورە و پێشکەوتوولە ناو شارەکە دروست بکات، ئەمە جگە لە هەڵکەوتەی شوێنی

جوگرافی شارەکە، پێگەیەکی گرنگی هەبوو، بە کۆمەڵێك گەروو دەورە درا بوو، گرنگترینیان گەرووی دەردەنیل و بسفۆرە، ئەمە جگە لەوەی هەردوو کیشوەری ئەوروپا و ئاسیا پێك دەبستێتەوە [1].

ئەم شارە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ گرنگی پێگەی سیاسی و ستراتیژی زیاد دەکرد، تاوەکو بووە یەکێ لە بەهێزترینی یەك لە دوو زلهێزەکانی جیهان لە بەرانبەر ئیمپراتۆری ساسانی، ڕۆژگار تێپەڕی، تا سەرهەڵدانی دوایین پەیام لە مەککە و دەرکەوتنی هێزێکی نوێ لە نیمچە دورگەی عەرەبی، کە ئەویش پەیامبەری ئیسلام بوو، ساڵی ٦٢٧ ز پێنجەمی کۆچی هاتە پێش ئەویش شەڕی خەندەق (الاحزاب ) بوو، سەرانی قورەیش بە هاوکاری هۆزەکانی دەورووبەر و جولەکەکانی مەدینە، ئابلۆقەیان خستە سەر شاری مەدینەوە، بەمەستی کۆتایی هێنان بە هاوشاری خۆیان، کە پێغەمبەر و هاوەڵانی بوو. لەو کاتە پێغەمبەر (د.خ) لەسەر پێشنیازی سەلمانی فارسی، فەرمانی بە هەڵکەندنی خەندەق بە دەوری شاری مەدینە کرد، هەر یەکە لە (تەبەری) و (ابن و کەسیر) ڕوداوێك دەگێڕنەوە، کە لە کاتی کارکردن لە خەندەقەکە هاوەڵان بە شێوەیەك کاریان دەکرد، ئەگەر کێشەیەك سەریهەڵبدایە ئەوە هانایان بۆ پێغەمبەر دەبرد، هەر دە هاوەڵ بە شێوەی تیمێك بەیەکەوە کاریان دەکرد، یەکێك لەو گروپانە بریتی بوو لە سەلمان و عوزەیفە و عەمر و نوعمان، شەش کەسیش لە هاوەڵە ئەنسارییەکان. لە کاتی ئیشکردن کۆمەڵە تاشە بەردێکی گەورەیان هاتە پێش، نەیاتوانی خۆیان لەو تاشە بەردە ڕزگار بکەن، بۆیە ناچار

---

[1] Murat ARSLAN ، İSTANBUL'UN ANTİKÇAĞ TARİHİ ; Klasik ve Hellenistik Dönemler , Birinci Baskı, Haziran 2010 , S 31

هانایان بۆ پێغەمبەر (د.خ) برد. ئەویش خۆی هات و دەستی کرد بە شکاندنی بەردەکە و سێ جار و بەتوندی کێشەی بە تاشە بەردەکەو ورد و خاشی کرد، هەر جارەی لەتێکی دەشکاند و تەکبیرەی دەکرد و هاوەڵانیش لە دوای پێغەمبەر تەکبیریان دەگوتەوە، تیشکی ڕوناکی لێ بەرز دەبوویەوە، سەلمان پرسی ئەی پێغەمبەری خوا، تۆ لەکاتی بەرز بوونەوەی بروسکەکە ئەم تەکبیرانەت بۆچی دەوت ؟ ئەویش ڕووی کردە هاوەڵان، وتی ئایا ئێوەش هەمان ئەوەی، کە سەلمان بینی و ئەو پرسیارەتان لا دروست بووە ؟ هاوەڵان وەڵامیان دایەوە، بەڵێ، پێغەمبەر فەرمووی لێدانی یەکەم لە تاشە بەردە و بروسکەکە حیرە و کۆشکەکانی خەسرۆ (ئەنۆشیروان)، بە من نیشاندران و جوبرائیل موژدەی گرتنی ئەم شوێنانەی بە موسڵمانان‌دا، لێدانی دووەم، خوا سەرزەمینی شام و ڕۆمی پێنیشان دام و جوبرائیل موژدەی گرتنی ئەو ناوچانەی لەلایەن موسڵمانان بە مندا، لێدانی سێیەم، خوا کۆشکەکانی سەنعای بە من نیشانداو جوبرائیل موژدەی گرتنی ئەو ناوچانەی لەلایەن موسڵمانان بەمن دا. لەو کاتەدا موسڵمانان هەمویان شادمان بوون و پیرۆزباییان لە یەکتر دەکرد.هەر لەو کاتەشدا مونافیقەکان کەوتنە پڕوپاگەندە دژی پێغەمبەر (د.خ) بەوەی کە دەیانوت ئێوە ئێستا ناتوانن لێرە واتە لە مەدینە سەر هەڵبڕن، چۆن پێغەمبەر (د.خ) موژدەی گرتنی حیرە و کیسرا و رۆم و سەنعاتان پێ دەدات !!؟؟ لەو کاتەدا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند (وَإِذْ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ مَّا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ إِلاَّ غُرُورًا (١٢) )

**ئیتر ئەم ئایەتە دڵنیایی تەواوی بە موسڵمانان‌دا، کە ئەوان لە داهاتوودا دەتوانن دەست بەسەر ئەو ناوچانەدا بگرن، ڕۆژگار تێپەڕی و لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب دوو لەو ناوچانە فەتحکران، کە ئەوانیش یەمەن و عێراق و ئێران بوو، ئەنجامەکەشی بریتی بوو لە ڕوخانی دەوڵەتی ساسانی. هاوکات دەسەڵاتی موسوڵمانان تا شاری دیاربەکری ئەمڕۆ هاتن و نزیکبونەوە لە قوستەنتینیە (ئەستەنبول) ی پایتەختی بێزەنتی. ئەوەی هێندەیتر موسوڵمانانی سوورتر کرد لە ئازادکردنی قوستەنتینیە، ئەویش ئەو فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) دەربارەی فەتحی ئەم شارە [١]، کە بە چەندین ڕیوایەتی جیاواز هاتووە، بەڵام هەموویان لە جەوهەردا یەك مانایان هەیە، ئەمە سەرەڕای جیاوازی بۆچوونی فەرموودە ناسان لەبارەی فەرموودەکە[2]، بە چەند شێوەیەك هاتووە، وەکو:**

---

[1] ئیبن و کەسیر : تەواور مێژوو ، و زاهیر محمد ، بەرگی ٣ ، سلیمانی ٢٠١٠ ، ل ٩٩٠–٩٩١

تەبەری : مێژووی تەبەری ، و زانەر محمد ، چوار چرا سلیمانی ١٠١٠ ، ل ١٠٦٢–١٠٦٣

[2] خلاف العلماء في صحة حديث (لتفتحن القسطنطينيه فلنعم الامير اميرها ) حديث عبدالله بن بشر الغنوي عن ابيه قال قال رسول الله صل الله عليه وسلم قال(لتفتحن القسطنطينيه فلنعم الامير اميرها ولنعم الجيش ذلك الجيش )رواه احمد وابنه في زوائده وابن خيثمه في التاريخ والطبراني والحاكم كما في الضعيفه ٨٧٨ وضعفه الالباني والوادعي وشعيب الارناؤوط في تحقيقه للمسند وصححه الحاكم والذهبي وبعض الفضلاء المعاصرين اقول علة الخلاف هو في عبدالله هل هو الغنوي ام الخثعمي ام ثالث ؟ فإن كان الاول قال الالباني وثقه ابن حبان وحده قلت ونقل الوادعي عن ابو حاتم انه قال عنه شيخ وان كان الثاني فهو ثقه وان كان شخص ثالث وهذا اضعف الاقوال فلا يعرف لكن مدارالاسانيد تضعه الغنوي كما عند احمد والحاكم وبعضها تقول الخثعمي وهذا ناتج في خلاف النسب او علة اخرى كضبط رواة او مخطوطه ونحو ذلك ولنفرض انه الغنوي وقال فيه ابو حاتم شيخ فقد سئل الالباني عن معنى قول ابو حاتم في الراوي شيخ فقال كلاما ان هذا فيه تفصيل ثم نقل عن الذهبي في مقدمة كتابه المغني انه لم يدخل فيه من قيل فيه صالح الحديث او لاباس به او شيخ فهي في مرتبة التعديل نقلا عن كتاب الروض الداني في الفوائد الحديثيه للعلامه الالباني ص ٦٣ وعليه العله التي جعلت هؤلاء يضعفون الحديث رجحوا انه الغنوي وكلمة شيخ

.١

دَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بن محمد بن اَبِي شَيْبَةَ، وَسَمِعْتُهُ اَنَا مِنْ عَبْدِ اللَّهِ بن محمد بن اَبِي شَيْبَةَ، قَالَ ثَنَا زَيْدُ ابى الْحُبَابِ، قَالَ حَدَّثَنِي الْوَلِيدُ ابى الْمُغِيرَةِ الْمَعَافِرِيُّ، قَالَ حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ ابي بِشْرٍ الْخَثْعَمِيُّ، عَنْ اَبِيهِ، اَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ لَتُفْتَحَنَّ الْقُسْطَنْطِينِيَّةُ فَلَنِعْمَ الآمِيرُ اَمِيرُهَا وَلَنِعْمَ الْجَيْشُ ذَلِكَ الْجَيْشُ قَالَ فَدَعَانِي مَسْلَمَةُ ابي عَبْدِ الْمَلِكِ فَسَاَلَنِي فَحَدَّثْتُهُ فَغَزَا الْقُسْطَنْطِينِيَّةَ[1] .

.٢

خبرني عبد الله ابى محمد الدورقي ثنا محمد ابي إسحاق الإمام ثنا عبدة بن عبد الله الخزاعي حدثني الوليد ابي المغيرة حدثني عبدالله ابي بشر الغنوي حدثني أبي قال سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول ثم لتفتحن القسطنطينية ولنعم الأمير أميرها ولنعم الجيش ذلك الجيش قال عبيد الله فدعاني مسلمةکورِیعبد الملك فسألني عن هذا الحديث فحدثته فغزا القسطنطينية هذا حديث صحيح الإسناد ولم يخرجاه[٢]

---

تفيد الجهاله عندهم حيث ان رواي هذه المنزله ليس كثير الروايه او لم يروي عنه عدد من الثقات او راوي اخر غير الغنوي ولا الخثعمي ولا اظن والله اعلم ان متن الحديث يستحق هذا التشدد خاصه ان لبعض متنه شاهد في الصحيح وهي التبشير بفتح القسطنطينيه اولا كما جاء في حديث اي المدينتين تفتح اولا ؟ قال مدينة هرقل يعني قسطنطينه وقد حدث هذا الحديث عمليا وقد فتحت عسكريا تحت قيادة امير عثماني كما هو ثابت في التاريخ فاقل احوال الحديث سنده حسن لقول ابو حاتم في الغنوي شيخ هذا ما اردت بيانه والحمدلله رب العالمين

[1] مسند الإمام أحمد ١٨١٨٩

[2] الحاكم في مستدركه ٨٣٠٠

٣. حدثنا معاذ بن المثنى ثنا علي بن المديني ح وحدثنا الحسين بن إسحاق التستري ثنا عثمان بن أبي شيبة قالا ثنا زيد بن الحباب عن الوليد بن المغيرة المعافري حدثني عبد الله بن بشر الغنوي حدثني أبي أنه سمع رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول ثم لتفتحن القسطنطينية ولنعم الأمير أميرها ولنعم الجيش ذلك الجيش فدعاني مسلمة بن عبد الملك فسألني عن هذا الحديث فحدثته به فغزا تلك السنة[١]

٤. بشر الغنوي ويقال الخثعمي قال أبو حاتم ميسري له البغوي وقال بن الموطأ عداده في أهل الشام روى حديثه احمد والبخاري في التاريخ والطبراني وغيرهم من طريق الوليد بن المغيرة المعافري عن عبد الله بن بشر الغنوي ومنهم من قال الخثعمي عن أبيه أنه سمع النبي صلى الله عليه وسلم يقول لتمنحن القسطنطينية ولنعم الأمير أميرها ولنعم الجيش ذاك الجيش قال فدعاني مسلمة بن عبد الملك فسألني فحدثته بهذا الحديث فغزا القسطنطينية قلت القائل ذلك هو عبدالله بن بشر ورواه بن الموطأ من هذا الوجه فقال بشر بن ربيعة الخثعمي وسيأتي في القسم الثالث بشر بن ربيعة الخثعمي فيحتمل أن يكون هو ويحتمل أن يكون آخر.[٢]

عەبدللای کوڕی عومەر دەگێڕێتەوە و دەڵێت ئێمە کۆمەڵێك لە هاوەڵان لە دانیشتنێکدا یەکێ لە هاوەڵان پرسی، ئەی پێغەمبەری خوا، کام شار

[1] الطبراني في معجمه الكبير ١٢١٦

[2] ابن حجر في الإصابة

یەکەمجار ڕزگار دەکرێت، ڕۆم یاخود قوستەنتینیە، ئەویش فەرمووی شارەکەی هەرەقل واتە قوستەنتینیە.[1]

ئەم موژدانەی پێغەمبەر (د.خ) لە هزر و ئەندێشەی موسوڵمانەکان مایەوە، هەریەکە و هەوڵی بەدەستهێنانی ئەم موژدەی پێغەمبەری دەدا، تا نیوەی یەکەمی سەردەمی فەرمانڕەوایی خەلیفەی سێیەم عوسمانی کوڕی عەفان، سنووری دەسەڵاتی ئیسلامی بەرەو فراوانبوون دەچوو، لە سنووری دیوارەکانی قوستەنتینیە نزیك دەبوونەوە، بەڵام هیچ هێرشێکی ڕاستەوخۆ ئەنجام نەدرا، بە سەرهەڵدانی جەنگی نێوخۆی موسوڵمانان هەڵمەتی فتوحات وەستا، بەڵام دوای کۆتایی هاتنی خەلافەتی ڕاشیدین و هاتنە سەرکاری ئەمەوییەکان، یەکەم هەوڵی ڕزگارکردنی قوستەنتینیە بە فەرمی لەلایەن موعاویەی کوڕی ئەبوو سوفیان درا، معاویە دوای کێبڕکێیەکی قووڵ لەگەڵ نەوەی ئەبوتالیب، توانی دەسەڵات بگرێتە دەست، پەلەکردنی معاویە بۆ گرتنی قوستەنتینیە ڕەنگە بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو باڵانسە بێت، کە شەڕی لەگەڵ خەلیفەی چوارەمی راشیدین عەلی کوڕی ئەبو تالب کرد بێت. ویستوویەتی فەزڵی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) بەدەست بهێنێت، دەسەڵاتی خلودی هەتا هەتای بۆ بنەماڵەی ئەمەوی مسۆگەر بکات، معاویە بەهۆی ئەزموونی ئەم ماوە درێژەی لە کاری والییەتی لە شام، گرنگی و ستراتیژی ئەم شارەی بۆ دەرکەوتبوو، هەر لەگەڵ هاتنە سەر کاری معاویە و بوونی بە خەلیـفەی ڕەسمی موسڵمانان لە ساڵی ٤١ك، دەستی کرد بە جێ

[1] عبد الله بن عمرو قال: بينما نحن حول رسول الله صلى الله عليه وسلم نكتب إذ سئل رسول الله صلى الله عليه وسلم أي المدينتين تفتح أولا قسطنطينية أو رومية؟ فقال النبي صلى الله عليه وسلم لا بل مدينة هرقل أولا ـ يعني القسطنطينية. صححه الذهبي في التلخيص، والألباني في السلسلة الصحيحة.

بەجێ کردنی فەتحی قوستەنتینیە، یەکەم کاریشی بریتی بوو لە کۆتایی هێنان بە یاخیبوونی (جوراجیمیە)، کە لە چیای تۆرۆس خۆیان قەیم کردبوو. ئەمە جگە لە ڕێکخستنی هەواڵگری و پەرەدان بە هونەری کەشتیگەلی و دروستکردنی چەندین ربات وەکو خاڵی جێگیر، ئەم خۆ ئەمادەکردنەی معاویە بە پڕۆسەیەکی هێمن و لەسەرخۆ تێپەڕیوە. [1] حەوت ساڵی خایەند تا ساڵی ٤٧–٤٨ کۆچی، لەو ماوەیە چەندین هێزی سەربازی بەردەوامی نارد و تا ساڵی ٤٩ ك، گەمارۆی خستە سەر شاری قوستەنتینیە، سوپاکە بەسەرکردایەتی یەزیدی کوڕی معاویە و بە ئامادەبوونی زۆرێك لە هاوەڵانی سابیقین وەکو (عەبدوللای کوڕی زوبێر، عەبدوللای کوڕی عومەر، عەبدوللای کوڕی عەمر،ابو ئەیوبی ئەنصاری)، ئامادەبوونی ئەم هاوەڵانەش دەگەڕێتەوە بۆ موژدەیەکی تری پێغەمبەر (د.خ) کە دەفەرموێت:(حديث مرفوع) حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ بن يَزِيدَ الدِّمَشْقِيُّ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بن حَمْزَةَ، قَالَ:حَدَّثَنِي ثَوْرُ بن يَزِيدَ، عَنْ خَالِدِ بن مَعْدَانَ أَنَّ عُمَيْرَ بن الآسْوَدِ الْعَنْسِيَّ، حَدَّثَهُ أَنَّهُ أَتَى عُبَادَةَ بن الصَّامِتِ وَهُوَ نَازِلٌ فِي سَاحَلِ حِمْصَ وَهُوَ فِي بِنَاءٍ لَهُ وَمَعَهُ أُمُّ حَرَامٍ، قَالَ عُمَيْرٌ:فَحَدَّثَتْنَا أُمُّ حَرَامٍ أَنَّهَا سَمِعَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: "أَوَّلُ جَيْشٍ مِنْ أُمَّتِي يَغْزُونَ الْبَحْرَ قَدْ أَوْجَبُوا" ، قَالَتْ:أُمُّ حَرَامٍ، قُلْتُ:يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنَا فِيهِمْ، قَالَ: "أَنْتِ فِيهِمْ " ثُمَّ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: "أَوَّلُ جَيْشٍ مِنْ أُمَّتِي يَغْزُونَ مَدِينَةَ قَيْصَرَ مَغْفُورٌ لَهُمْ" ، فَقُلْتُ:أَنَا فِيهِمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: "لاَ[2]"

---

[1] تەبەری ، بەرگی حەوت ، لا ٢٧٩١–٢٧٩٥

[2] صحيح البخارى رقم الحديث: ٢٧٢١

یەکێك لەو هاوڵانەی، کە سوور بوو لەسەر بەشداری ئەم جەنگە، ئەبو ئەیوبی ئەنساری بوو، هەر چەندە ئەو زۆر پیر بوو، ئەبوو ئەیوب لە موسوڵمانە سەرەتاییەکان بوو، کە باوەڕی بە پێغەمبەر (د.خ) هێنا، ئەو خەڵکی شاری مەدینە بوو، ڕۆڵێکی سەرەکی لە پەیمانەکانی عەقەبەی یەکەم و دووەم بینی، زۆر هانی پێغەمبەر (د.خ) ی دەدا، کە ڕوو لە شارەکەی ئەوان بکات، کاتێك پێغەمبەر (د.خ) کۆچی بۆ مەدینە کرد، یەکەم کەس کە میوانداری کرد ئەبو ئەیوبی ئەنساری بوو، مانگێك لەماڵیان مایەوە. ئەو کاتە لە جوامێرەکانی مەدینە بوو، پیاوێکی بازرگان و دەوڵەمەند بوو. لە کاتی بەشداریی شەڕی قوستەنتینیە زۆر پیر و بە ساڵاچوو بوو،هەر لەوێ وەفاتی کرد، وەسیەتی بۆ یەزید کرد، کە تەرمەکەی لە نزیك دیوارەکانی ئەو شارە بنێژن، یەزیدیش وەسیەتەکەی جێ بە جێ کرد، هەر لەوێ ناشتی و هەڕەشەی توندیشی لە بێزەنتیەکان کرد، کە ئەگەر تەرمی ئەبو ئەیوب دەستکاری بکەن مەسیحیەکانی جیهانی ئیسلامی لە ناو دەبەن. موسوڵمانەکان دوای شەش مانگ لە گەمارۆدانی قوستەنتینیە بێئاکام بوون، سەرما و بای بەهێز و کەمی ئازووقە خۆراك و پتەویی شووراکانی شارەکە، هۆکار بوون بۆ سەرنەکەوتنی موسوڵمانەکان لە ڕزگارکردنی قوستەنتینیە [١].

هەرچەندە هەڵمەتی دووەم هەر لە سەردەمی معاویە لە ساڵی ٥٦-٦٠ ك بەردەوام بوو، بەڵام ئەمیش بێئاکام مایەوە، بۆیە معاویە هەستی کرد،

---

[1] علی صلابی : معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان کەسایەتی و سەردەمی ، و ئەبوبەکر لۆتەری ، دارو المعریفە بیروت ٢٠١٣ ، لا ٥٧٥-٥٧٦

کە ئیتر پیر بووە، مانەوەی سوپاکەش لەو ماوە دوور و درێژە هیچ ئەنجامێکی نەبوو، بێ ئومید بوو لە گرتنی شارەکەو گەمارۆی سەر شارەکەی هەڵگرت. بە پەیماننامەیەکی ئاشتی کۆتایی پێ هات [1].

هەوڵی دووەم بۆ گرتنی قوستەنتینیە لەژێر حوکمی بنەماڵەی ئەمەوییەکان و لە سەردەمی سلێمانی کوڕی عەبدومەلیك ڕوویدا لە ساڵی ٩٨ ك (٦١٧–٦١٨)، کە بەسەرکردایەتی براکەی خۆی کە مەسلەمەی کوڕی عەبدومەلیك بوو، ناردیە سەر قوستەنتینیە. لەو کاتەدا پاشای ئەو شارە مرد، یەکێ لەسەرکردەکانی ئازەربێجان کە ناوی لیۆن بوو، هەواڵی مردنی بە سلێمان داو، ڕایگەیاند کە بەڵێنی لەخەڵکی شارەکە وەرگرتووە، دەرگای قوستەنتینیە لە سوپای ئیسلام بکەنەوە، مەسلەمە لەگەڵ لیۆن بەرەو شارەکە بەڕێکەوتن، مەسلەمە زانی کە شەڕێکی سەخت و دریژخایەنی لە پێشە، بۆیە خۆراکێکی زۆری لەگەڵ خۆی برد. فەرمانی بە سوپاکەیدا لەو خۆراکە عەمبار کراوە نەخۆن، بەڵکو سوود لە کشتوکاڵی ئەو ناوچانە وەرگرن، بەم شێوەیە زستانی بە گەمارۆدانی شارەکە تێپەڕاند.

ڕۆمەکان نوێنەریان بۆ لای (مەسلەمە) نارد و پێشنیازی دانی سەرانەیان بۆ مەسلمە کرد، لە بەرانبەر هەر کەسێك ئامادەن دینارێك بدەن، بەڵام مەسلەمە ڕەتی کردەوە، بەڵکو تەنها بە تەسلیمکردنی شارەکە رازی دەبوو. لەو کاتەدا ڕۆمەکان بەڵێنی پێدانی حاکمیەتی شارەکەیان بە لیۆن دا، ئەگەر سوپای ئیسلام لە شارەکەیان دوور

[1] علی صلابی ، ل ٥٨٠

بخاتەوە، لە ڕاستیدا مەسلەمە پیاوێكی زیرەك و لێهاتوو بوو، بەڵام هەستی بەوە نەكرد، كە لیۆن پیاوێكی فێڵباز و تەماحكارە،هەموو ئومێدی گرتنی شارەكەی لە سەر متمانەی لیۆن هەڵچنی بوو، بۆیە لیۆن كەوتە هەڵخەڵەتاندنی مەسلەمە وتی:ڕۆمەكان دەزانن كە تۆ سوپاكەت بە گیان و دڵ شەڕ لەگەڵ ئەوان ناكەن تا ئەو كاتەی خۆراكت هەیە، درێژە بە گەمارۆی سەر شارەكە دەدەیت. ئەگەر فەرمان بكەیت بە لەناو بردنی خۆراكەكانت، ئەوان ناچار گوێڕایەڵی فەرمانت دەبن.مەسلەمە وای كرد، بەڵام ئەم كارە بووە هۆی ئەوەی كە سوپای ئیسلام بەبێ خۆراك بمێنەوە تا ئەو ڕادەیەی كە لە برسان پەنایان بۆ خواردنی گیا و پێستی ئاژەڵ دەبرد. برسیەتی تینی بۆ سوپاكەی مەسلەمە هێنا، بە جارێك تینی لێ بڕین، شەكەت و ماندوو بوون، هاوكات خەلیفەی ئەمەوییەكان سلێمانی كوڕی عەبدول مەلیك مرد. بەمەش گەمارۆی سەر شارەكە شكا [1].

بە هاتنی سەردەمی عەباسییەكان بۆ سەر حوكم، هەر چەندە بە درێژایی ئەم ماوەیە ڕووبەڕووبوونەوە لە نێوان ڕۆم و موسوڵمانەكان هەبوو، بەڵام بە هیچ جۆرێك هەڕەشەی سوپای موسوڵمانان نەگەیشتە لای دیوارەكانی شاری قوستەنتینیە، تا هاتنی دەسەڵاتی توركە سەلجوقییەكان.

گەورەترین سەركەوتنی سەلجوقییەكان لە بەرامبەر بێزەنتییەكان، بریتی بوو لە شەڕی مەلازگرد ١٠٧١ ز، كە سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) بە سوپایەكی كەم توانی خودی پاشای ڕۆم (ڕۆمانوس) بەدیل بگرێت.

---

[1] ئیبن كەسیر : بەرگی ٧ ، لا ٢٦٦٦–٢٦٦٧

لەوشەڕەدا کوردەکان ڕۆڵێکی گرنگیان بینی، هاوشان لەگەڵ سەلجوقییەکان لە دژی ڕۆمەکان. مێژوونووسەکان ئاماژە بەوە دەکەن، کە نزیکەی ١٠،٠٠٠ هەزار لە سوارچاك و شەڕکەری گەنجە کوردەکان لەم شەڕە بەشداربوون. ئەمەش دوای ئەوە هات کە ئەلب ئەرسەلان لەو باوەڕە نەبوو کە ڕۆمەکان ئەو سوپایە زل و زەبەلاحە کۆبکەنەوە، کە لە هاوپەیمانی ڕۆم، ڕووس، کەرەج و بجناك پێك هاتبوو. کە بە بڕوای دکتورە نیشتمان ئەمیش لە مێژوونووس ئیبن عیبری گواستۆتەوە ئەو کۆیلەیەی کە (ڕۆمانۆس) پاشایی بە دیل گرتبوو، کوردێك بوو بە ناوی شادی [1].

سەردەم بەخێرایی تێپەڕی خۆری ئیمپڕاتۆرە پان و پۆڕەکەی سەلجوقییەکان بەرەو ئاوا بوون چوو، دەسەڵاتێکی نوێ، بەهێزو توانا و تەکنیکێکی سەربازیی و ئیداریی نوێ، هاتە سەر شانۆی سیاسی و توانی ڕابەرایەتی جیهانی ئیسلامی بکات، ئەویش عوسمانە تورکەکان بوون، لە ڕاستیدا ئەوان خۆیان هەر بە نەوە و جێگرەوەی سەلجوقییەکان دەزانی.

سوڵتان ئۆرخان توانی بونیاد و بناغەی دەوڵەتی عوسمانیی بەهێز دابمەزرێنێت، لە دوای خۆی دەوڵەتێکی پڕ لە سامان و سوپایەکی ڕێکخراو دروست بکات، کە ئەویش سوپای ئینکیشاری بوو، لە ساڵی ١٣٢٤ز. تا هاتنی سوڵتان بایەزیدی یەکەم ١٣٩٠ ز کە بە سوڵتانی (هەورە بروسکە) ناسرا بوو، ئەمەش بەهۆی ئەو خێراییەی لە فەتحکردن و

[1] نیشتیمانبەشیر : کورد و سەلجوقیەکان ، لێکۆلینەوەیەك لە پەیوەندیە سیاسیەکانیان (١٠٢٩-١٠٢٧)، چاپی دووەم ٢٠٠٦ لا ٣٣٩-٣٤٠

فراوانکردنی قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمان هەیبوو، لە سەردەمی بایەزید جارێکیتر بیرۆکەی گرتنی قوستەنتینیە کەوتەوە بەر ئەندێشە و ستراتیجی سوڵتان، بۆ ئەم مەبەستەش هێزێکی زۆری کۆکردەوە. لە ساڵی ١٣٩٣ ز ئابلوقەی تەواوی خستە سەر شارەکە، ئیمپڕاتۆری ڕۆم مانۆیل بە تەواوی ترسی لێنیشتبوو، ترسی کەوتنی شارەکە بە هەموو جیهانی مەسیحییدا بڵاوببوویەوە، کۆبوونەوەی خێرا و بەپەلە لە شاری ڤێنسیا ڕێکخرا، هەموو پادشاکانی جیهانی مەسیحی کۆك بوون لەسەر بەرگریکردن لە ئەم مەبەستەش هاوپەیمانییەکیان بەست، کە ١٥ وڵاتی زلهێزی لە خۆگرتبوو،کاتێ سوڵتان بەمەی زانی، هەر زوو پەلاماری بولغاریای داو، دەستی بەسەرداگرت، دواتر دەستی بەسەر هەنگاریاشداگرت. بەڵام بەهۆی بەردەوامی دانوستانەکانی نێوان سوڵتان پاشای ڕۆم، وەکو فێڵ و تاکتیك دژ بە سوڵتان، توانی کۆمەکییەکی زۆر کۆبکاتەوە، لە بەختی سوڵتان بایەزیدیش تەیموری لەنگ دەستی کرد بە هێرشکردنە سەر سنوورەکانی دەوڵەتی عوسمانیی، بۆیە بۆ جاری سێیەم لە مێژوودا گرتنی قوستەنتینیە شکستی هێنا و پڕۆژەکە بۆ ماوەیەکی کاتی هەڵوەشایەو[1].

خەونی فەتحی قوستەنتینیە جارێکی تر لە سەردەمی سوڵتان موڕادی دووەمی باوکی محەمەد فاتیح سەری هەڵدایەوە، چەندین بۆ گرتنی شارەکە هەوڵ درا، لە ڕۆژانی سەردەمی موڕاد چەندین جار

[1] Ord. Prof. İsmail Hakkı UZUNÇARŞILI : OSMANLI TARİHİ 1., ANKARA 1988 Cilt ، s 250-253

ئابلوقەی خستە سەر شارەکە، بەڵام بەهۆی یاخیبوون و ئاژاوەی نێوخۆی سوپای ئینکیشاری هەوڵەکان شکستی دەهێنا. تا هانتە سەر کاری محەمەدی کوڕی، جارێکیتر توانی بە پڕۆژەیەکی پتەو و مەعنەویاتێکی بەرزەوە فەتحی شاری قوستەنتینیە بکات.

## ٢. ١٩:ڕۆڵی مەلا گۆرانی لە فەتحی قوستەنتینیە:

ڕۆڵی مەلا گۆرانی لە فەتحی قوستەنتینیە، تەنها بۆ ساتەکانی شەڕکردن ناگەڕێتەوە، بەڵکوو ڕۆڵی بۆ سەردەمانێکی زۆر زووتر، واتە بۆ سەردەمی منداڵیی محەمەد فاتیح دەگەڕێتەوە، زیادەڕۆییمان نەکردووە، ئەگەر بڵێین کارەکتەری مەلا گۆرانی نەبووایە، قەت فەتحەکە لە سەردەمی محەمەد فاتیح ڕوووینەدەدا، بە بەڵگەی ئەوەی کاتێك مەلا گۆرانی دەستی کرد بە پەروەردە و پێگەیاندنی فاتیح، ئەو جگە لە منداڵێکی سەرەڕۆ و لاسار، هیچیتر نەبوو. مەلا گۆرانی توانی سەر لە نوێ بناغەی پەروەردەیەکی تەندروست بۆ ئەم منداڵە لاسارە دابڕێژێت و بیکاتە گەنجترین سوڵتان لە بنەماڵەی عوسمانییەکان، بێگومان ئەو ماوەی کە سوڵتان موڕاد، محەمەدی شاهزادەی تەسلیم بە مەلا گۆرانی کرد، تا ئەرکی پەروەردەیی و زانستی خستە سەرشانی. مەلا گۆرانیش توانی بە جۆرێك ئەرکەکەی ڕابپەڕێنێت، کە خۆشحاڵیی بێ سنووری سوڵتانی بەدوای خۆیدا هێنا. لەپاڵ قورئانی پیرۆز، دەرسی فەرموودەشی بە محەمەد شازادە داوە، یەکێك لە پەرتووکە گرنگەکانی فەرموودەش مەسنەدی ئیمامی ئەحمەدە کە فەرموودەی موژدەی فەتحی قوستەنتینیەی پێغەمبەر (د.خ) ی تیادا هاتبوو، ڕەنگە مەلا گۆرانی زۆر هەڵوێستەی لەسەر ئەم فەرموودە بۆ محەمەد شازادە

کردبێت،وەك لە ئەرشیفی تۆپ کاپی دا بە ژمارەی E 10231، STR، 12.هاتووە، کە بیرۆکەی فەتح کردنی ئەستەنبوڵ بە دیاریکراوی مەلا گۆرانی خستۆتیە بیر و ئەندێشەی محەمەدی شاهزادە، [1] ئەم نامەی مەلا گۆرانی یەکێکە لەو نامانەی کە بەخەتی خۆی نووسیویەتی، لە کۆتایی لاپەڕەکەشدا ئیمزای کردووە، ئەم نامە مێژووی نووسینەکەی بۆ دوای وەفاتی محەمەد فاتیح دەگەڕێتەوە، واتە سەردەمی بایەزیدی دووەم، مەلا گۆرانی وەکو ڕۆمانێك چیرۆکی ئاوارەیی و قۆناغی شام و قاهیرە وە هاتنی بۆ ئەنادۆڵ و چالاکییەکانی، کە لە سەردەمە جیاوازەکاندا ئەنجامی داون، بۆ بایەزیدی باسکردوون، وەکو ئەوەی کە دووبارە پێویست بکات، کەسایەتی خۆی بە سوڵتانی نوێ بناسێنێت، لە دێڕی دوانزدەهەم دا مەلا گۆرانی ئاماژە بەوە دەکات، کەبیرۆکەی فەتحی قوستەنتینیەی خستۆتە ئەندێشەی محەمەد فاتیح، بە بەردەوامی هانی داوە، و بە پەرۆش بووە، تا ئەنجامەکەشی بینیووە.

[1] YILDIZ : S 56



Yıldız s 106

فەتحکردنی شارەکە لە تەمەنێکی زۆر منداڵیی دا هەموو ئەندێشەو بیرکردنەوەی محەمەد فاتیح داگرتبوو، بە جۆرێك خەوی لە چاوانی زڕاند بوو، سەرچاوە عوسمانییەکان باس لە ڕووداوێك دەکەن کە شەوێك لە نیوە شەودا مەلا گۆرانی، کە تیشکی ڕووناکی لە ژوورەکەی شازادە

محەمەد دا بەدی دەکات، بۆیە بە پەرۆش دەبێت، کە ئایا بەم نیوە شەوە بۆ دەبێت شازادە نەنووستبێت، کاتێك دەچێتە ژوورەوە بۆ لای، دەبینێ نەنووستووە، لێی دەپرسێت بۆچی تا ئیستا نەنووستوویت ؟ محەمەد شازادە وەڵام دەداتەوە کە خەریکی ئیشکردن بووم ؟ مەلا گۆرانیش بە سەرسامییەوە دەپرسێت لە کام وانە دەتخوێند ؟ شازادە لەو کاتەدا بە مەلەلی و بێدەنگ دادەمێنێت، مەلا گۆرانیش سەیری نووسینەکانی بەر دەستی دەکات، تێدەگات کە نەخشەی فەتحی قوستەنتینیە سەرقاڵی کردووە، ئینجا دواتر دەکەوێتە ڕوونکردنەوە بۆ مەلا گۆرانی و دەڵێت:مامۆستاکەم تا ئیستا کە قوستنەنتینیە فەتح نەکراوە، ناخم بۆی دەسووتێت ؟ چونکە پێغەمبەر (د.خ)ی ئازیز بەڵێنی بە هاوەڵان داوە، ئەو هەموو مرۆڤە پیرۆزانەی گیانیان لە پێناویدا بەخت کردووە. بۆچی تا ئیستا فەتح نەکراوە ؟ ڕێگای فەتحی ئەم شارە چییە تا ئیستا نەمان توانیوە سەنگەرەکانی بێزەنتی ببەزێنین، ئەو پرسیارە لە مێشکم دەرناچێت، تا ئەوەی خەوی لە چاوانم زڕاندووە، تا بەیانی پلانی بۆ دادەڕێژم.[1] ڕوهات ئالاکۆم جەخت لە سەر ئەم بۆچوونە دەکاتەوە کە یەکەم بیرۆکەی فەتحی ئەستەنبۆڵ لە لایەن مەلا گۆرانییەوە بە سوڵتان محەمەد فاتیح ڕاگەیانراوە.[2]

نووسەر و لێکۆڵەرە تورکەکانیش لە نووسینەکانیان حاشایان لەو ڕاستیە نەکردووە، (فاتیح شەکر) لە گۆڤاری (قوڵای مێژوو) کە گۆڤارێکی وەرزی بەنێوبانگی وڵاتی تورکیایە، لە مایسی ساڵی ٢٠١٢ بابەتێکی لە

---

[1] Hüseyin Tekinoğlu ; S 29-30

[2] کوردەکانی ئەستەنبۆل : ل ٢٩

ژێرناوی (زانایەکی بێ پەروا مێشکی محەمەد فاتیح دەگرێت ) نوسیووە، نووسەر زۆر بە وردی تیشکی خستۆتە سەر ئەوەی کە چۆن مەلا گۆرانی بیرۆکەی فەتحەکەی لە ئەندێشەی محەمەد فاتیح چەسپاندووە.[1]

هەرچەندە لەپاڵ گۆرانییش چەند کەسایەتییەکتری گرنگ ڕۆڵیان لە پرۆسەی فەتحەکە بینیوە، ئەویش لە ڕووی سەربازییەوە کەسایەتی (زاغانوس پاشا )، کە لە هەمان کاتدا خەزوری فاتیح بووە، کەسی دووەمیش بریتی بوو لە زانای ناوداری ئەو سەردەمە، ئاق شمەسەدین. کاتێك باس لە هۆکارە مەعنەویەکانی سەرکەوتن دەکەین، ناکرێت خۆمان لە گرنگی کەسایەتی (ئاق شەمسەدین) ببوێرین، بۆیە گرنگە لێرەدا هەڵوێستەیەك لەسەر ژیان و کەسایەتی ئەم زانایە بکەین، ئاق شەمسەدین مامۆستای محەمەدی فاتیح بووە، لە ساڵی ١٣٨٩ ز لە شام لەدایك بووە، ناوی تەواوی شێخ محەحەد شەمسەدینی کوڕی حەمزەیە. لە باوکییەوە نەسەبی دەگەڕێتەوە بۆ حەزرەتی ئەبو بەکر (ر.خ) گەورەترین زانا و سۆفیی سەدەی پازدە بووە. لەبەرئەوەی جلوبەرگی سپی لەبەر دەکرد و سەر و ڕیشیشی سپی بووە، بۆیە بە ئاق شەمسەدین بەناوبانگ بووە، وشەی (ئاق) لە زمانی تورکییدا بە مانای (سپی) دێت. بە فەتحکردنی مەعنەوی ئەستەنبۆل ناسراوە. خوێندنی سەرەتایی لای باوکی شیخ حەمزە تەواو کردووە، بەهۆی زیرەکیی و بەهرەدارییەوە دەوروبەرەکەی سەرسام کردووە، بەشێوەیەك کە لەتەمەنی ٧ ساڵیدا بووە بە حافز. بە نیشتەجێبوونی لە کەڤاك بوجاکی سامسون لە قوتابخانەکانی ئوسمانجك

[1] 90 SAYI 2 ، MAYIS 2012DERİN TARİH

و ئەماسیا خوێندنی تەواو کردووە. بە هۆی زیرەکی و بەهرەداریەوە لەماوەیەکی کەمدا لە بوارەکانی ماتماتیك، ئەستێرەناسی، پزیشکی و دەرمانسازییدا خۆی سەلماندووە، بەشێوەیەك ناوی چووەتە نێو زانا بەناوبانگەکانی ئەو سەردەمە. ئاق شەمسەدین وەکو زاناکانیتر لەپاڵ زانست، ویستوویەتی عیرفانیش تەواو بکات، بۆ ئەم مەبەستەش چووەتە ئێران و ماوەیەك لەوێ ماوەتەوە. بەهۆی سەرکەوتنەکانیەوە، موڕادی دووەم بە مامۆستای کوڕەکەی دایدەمەزرێنێ. وەکو ئەوەی لەهەر بابەتێکدا ڕێنیشاندەری محەمەد بووە، لە فەتحکردنی ئەستەنبۆڵیشدا، بەهەمان شێوە لای سوڵتان بووە و هەمیشە پاڵپشت و هاندەری بووە. لەدوای فەتحکردنی شارەکە لە تەنیشت سوڵتانەوە بووە،بۆ چوونە نێو شارەکە، خەڵکی شارەکە ئەو بەسوڵتان تێگەیشتوون و گوڵیان پێشکەشی کردووە، بەڵام ئەو قەبوڵی نەکردووە و ئاماژەی بۆ سوڵتان کردووە.سوڵتانیش بە ووتنی ئەوەی کە" گوڵەکان بدەن بە ئەو، ئەو مامۆستامە" ڕێزی خۆی بۆ ئاق شەمسەدین پیشان داوە. بەم شێوەیە یەکەم کەس هاتبێتە شارەکەوە، ئاق شەمسەدین بووە.محەمەدی فاتیح بە خوێندنی وتاری لە ئایەسۆفیادا، ئاق شەمسەدینی وەکو یەکەم ئیمام داناوە، بەم شێوەیە لەدوای فەتح یەکەم نوێژ بە پێشنوێژی ئاق شەمسەدین بووە. لە دوای فەتح دەچێتە گیۆینوك و دوای ماوەیەك ژیان لەوێ، لە تەمەنی ٧٠ ساڵیدا، واتا لە ساڵی ١٤٥٩ وەفات دەکات.[١]

---

[1] TDV İslam Ansiklopedisi, yıl: 1989, cilt: 2, sayfa: 299-302.




**ئاق شەمسەدین (ئەندێشەیی خەیاڵی)**

لە بڕیارەکانی سەربازی و کارگێریی، کە مەلا گۆرانی وەکو بەرپرس دامەزرا بوو لە پاڵ ئەو دوو کەسایەتیەی سەرەوە، گرنگترین سەرچاوەی هێزی محەمەد فاتیح و بەرزکردنەوەی وورەی بوون، تا بەردەوام بێت لەسەر پرۆژەکەی و سارد نەبێتەوە.

کاتێك فەتحەکە نزیك بوو فاتیح دەستی بە ئامادەکاری کرد، بۆ ئەم مەبەستەش سێ کۆبوونەوەی گشتی گرنگی ئەنجامدا، کۆبوونەوەی یەکەم

بۆ بڕیاردانی فەتح بوو لە ئەدرنە، بێگومان ئەم کۆبوونەوەیە بە بڕیاری ناردنی سوپا بەرەو قوستەنتینیە درا، گۆرانیی ناوی تیادا هاتووە،[1] لە ژێر ڕۆشنایی ئەم بڕیارە، بە حوکمی پلەکەی بێگومان مەلا گۆرانیی ئامادەی کۆبوونەوەکەش بووە. بەڵام لە هەندێ سەرچاوەیتر باس لە هەر یەکە لە مەلا خەسرۆ و مەلا گۆرانی کراوە، بە سیفەتی موجاهید، لەنێو ڕیزی سوپادا بەشدار بوون.

توانیان ٢٥٠ هەزار سەربازی مەشقپێکراو و پڕ چەك ئامادە بکەن و بەرەو شورا پۆڵایینەکانی شاری قوستەنتینیە بە ڕێ بکەون،ئەم سوپایە لە یەکەم ڕۆژەکانی مانگی نیساندا لە ئەدرنەوە هاتوونەتە دەوروبەری قوستەنینیە و توانیویانە ئابلوقە بخەنە سەر شارەکە، ئەم ماوەیەش لە ٦ نیسان تاوەکو ٢٩ مایس، واتە ٥٤ ڕۆژی خایاندووە.

ئەم سوپا ڕێکخرا بەهێز و سەردەمییە لە بەیانی ٦ نیسان بە پێشکەوتووترین چەکی ئەو سەردەم، هێرشیان کردە سەر شاری قوستەنتینیە، بەڵام لە٢٠ی هەمان مانگدا کێشەی کەشتییە سەربازییەکان هاتە ڕێگایان، ئەم کێشەیە محەمەد فاتیحی ناچارکرد، دووەم کۆبوونەوە ڕێکبخات و سەدری ئەعزەم چاندارڵ خەلیل پاشا و هەندێ لە ڕاوێژکارەکانیتر پێشنیازی کشانەوەی سوپای عوسمانییان کرد و داوای ڕێککەوتنیان لەگەڵ پادشای بیزانس کرد، هەر چەندە هەندێ لە مێژوونووسان ئاماژە بە ناردنی بەرتیلێکی زۆر دەکەن، کە لەلایەن پاشای بیزەنس درا بوو، بە بەشێك لە ڕاوێژکارەکانی سوڵتان، بەڵام باڵی پیاوانی

[1] روهات ئالاکۆم : ل ٢٩

ئايينى كه بريتى بوون له مەلا گۆرانى و ئاق شەمسەدين و زاغانۆس پاشا، سووربوون لەسەر توندكردنى ئابلوقەكە و بەردەواميدان بە هێرش بۆ سەر شارەكە، سوڵتانيش بۆچوونى مامۆستاكانى و خەزوورى لا پەسەندتر بوو.

لەوكاتەدا قوستەنتين هەوڵيدا لەڕێى گفتوگۆوە فاتيح ڕازى بكات و دەست لە ئابلوقەدانى شارەكە هەڵگرێت، بەڵام فاتيح جگە لە گرتنى شارەكە بيرى لە هيچيتر نەدەكردەوە، بۆيە بۆيانى نووسى كە شارەكە بدەن بە دەستەوە، بەڵێن بێت يەك مەسيحى ئەزيەت نەدەم، يەك كڵێسە نەڕوخێنم، كێ حەزدەكات بمێنێتەوە، سەر و ماڵى پارێزراوە، كێش حەزدەكات بۆ هەر كوێيەك بڕوات ڕێگای لێناگرين.

لەپاڵ ئەم مەعنەوياتە بەرزە، تۆپەكانيش ڕۆڵێكى سەرەكيان گێڕا بۆ شكاندنى شوراى شارەكان، بەرهەمى ئەم تۆپانە پڕۆژەى پياوێكى بە ڕەگەز مەجەرى بوو بە ناوى (ئوربان)، كە توانى بۆ يەكەم جار لە مێژوودا ئەم جۆرە تۆپە زەبەلاحانە بخولقێنێت و كارێكى واى بە بێزەنتييەكان كرد، كە ترسێكى زۆريان لە دڵدا نيشت، بە جۆرێك شەويان لێ بووە ڕۆژ، ڕۆژيشيان لێ بووە شەو، واتە ئاگر و پشكۆى تۆپەكان لە شەودا دونياى كردبووە ڕۆژ، هەروەها وێرانى و ڕووخانى ديوارەكان و تەپ و تۆزيش، ڕۆژى كرد بووە شەو[1]. چونكە شكستى سوپاى عوسمانيى لە ڕووى دەرياوانەوە سەدرى ئەعزەمى تەواو بێ ئومێد كرد بوو، جوگرافياى شارى قوستەنتينيە وا هەڵكەوتبوو، كە لە سێ لاوە بە ئاو دەورە درا بوو،

[1] نیقولو باربارو : الفتح الاسلامی للقسگنگینیه ، اليومات الحصار العپمانی ١٤٥٣ م ، ترجمه د حاتم الگحاوی ، ٢٠٠٢، ص ٣٦

بێزەنتینەکان لەپاڵ شورا قایم و بەهێزەکانی شارەکە، تەواوی گەرووی قەرنی زەهەبیان بە زنجیر بەستبوو، تا بەو هۆیەوە ڕێگری بکەن لە نزیکبوونەوەی کەشتییەکانی عوسمانیی، توانیان شکست بە سەرجەم ئەو هێرشانە بهێنن کە لە ڕووی دەریاوە دەکرایە سەریان. فاتیح لەم پیلانەی بێزەنتییەکان زۆر ناڕەحەت بوو، بە تەواوی پەشۆکا بوو، بە جۆرێك وەزیری دەریایی بانگ کرد و زۆر سەرزەنشتی کرد، لە ئەنجامدا بڕیاری لابردنیدا و هەمزە پاشای لە شوێنی دانا، هەر چەندە فاتیح خۆی لەو باوەڕە بوو، کە سەرنەکەوتنی سوپاکەی لە ڕووی دەریاییەوە، بەهۆی بێهێزیی یاخود ترسنۆکی سوپاکەی نییە، بەڵکوو کێشەی گەورە زنجیرەکانە، بۆیە زۆر پەشۆکا بوو بە جۆرێك حەزی دەکرد بە ئەسپەکەی بازبدات تا کەمەری ئەسپەکەی لە دەریادا بزر دەبوو، دەچووە پێش و دەیویست و بچێتە ناو شورەی قەڵاکان.






نموونەی تۆپەکان، مۆزەخانەی (تۆپ کاپی سەرای)

فاتیح بە زیرەکیی و لێهاتوویی خۆی، توانی زنجیری بەردەم کەشتییەکانیش چارەسەر بکات، بۆیە پلانێکی بەدەر لە فکری یاسای سەربازیی دارشت ! کە بریتی بوو لەوەی کەشتییەکانی سوپای عوسمانیی لە ناوچەی (بێشك تاش)، بەسەر وشکانی و بەهێزی دەستیان بخەنە دوای زنجیرەکان، بۆیە ئەم ناوچەیە دارستانێکی چڕ و پڕ بوو[1]، سەرەتا دەستیان کرد بە بڕینەوەی دارەکان و دواتر دارە بڕاوەکانیان وەکو فەرش ڕاخست، ئینجا زەیتی چەورکراویان بەسەردا کرد، تا وەکو کەشتییەکان بە ئاسانی بەسەر دارەکاندا بڕوات، بەمەش توانییان بە شێوەیەکی خێرا و دەست وبرد ٧٠ کەشتی بگوازنەوە ئەو دیوی

[1] نیقولو باربارو : ص ٨٧–٨٨

زنجیرەکان، بەمەش توانیان دواجار لە گرفتی زنجیرەکان ڕزگاریان بێت [1].

بێزەنتییەکان بەیانی لەگەڵ هەڵاتنی خۆر چارۆگی کەشتی عوسمانییان بۆ دەرکەوت، هەر چەندە نەیاندەویست بڕوا بە چاوی خۆیان بکەن، لە یەکتریان دەپرسی، کە کەشتی تەنها دەتوانێ بەسەر ئاودا بڕوات، نەك لە ئاسمان بفڕێت ! چۆن ئەم کەشتییانە توانییان ئەم بەربەستە ئاسنینە ببڕن ؟!

عوسمانییەکان لە تەکنیکی نوێ نەدەکەوتن، هەر ڕۆژەو بە جۆرێك و بە تەکنیکی جیاواز، هێرشیان دەستپێدەکرد، ئەم تەکنیکانەش نەك هەر لە پێشبینی بیزەنتییەکان نەبوو، بەڵکوو بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی بەکاری نەهێنا بوو، ئەمەش بۆ داڕشتنی پلانی چەندینساڵەی محەمەد فاتیح دەگەڕایەوە، بۆیە ئەمجارە دەستیان کرد بە جێبەجێ کردنی پلانێکی ئێکجار سەرسوڕهێنەر، ئەویش هەڵکەندنی زەوی بوو، بۆ ئەوەی سەربازە عوسمانییەکان بگەنە ناو جەرگەی شارەکە، لە کاتێکدا بیزەنتییەکان چاودێریی چڕی ئاسمان و سەر قوللەی شارەکانیان دەکرد، تا لەوێوە سەربازە ئینکیشارییەکان دەربکەن، بەڵام کاتێك هەستیان ڕاگرت، دەنگی تەور و پێچە لەژێر پێیەکانیان دێت، سەربازە عوسمانییەکان لەگەڵ خۆیاندا باروت و نەوتێکی زۆریان برد، تا بتوانن ژێر شارەکە بتەقێننەوە، بەڵام کاتیك زانییان لە ژێر زەوین کەوتنە بۆسەی سەربازانی بێزەنتی و نەیانتوانی بە زیندوویی رزگاریان بێت و ئامادەش

[1] الدكتور محمد مصطفى صفوت : سلطان محمد الفاتح ، فاتح القسطنطينية ، دار الفكر العربى ، ١٩٤٨ ، ص ٨٢-٨٤

نەبوون خۆیان بدەن بە دەستەوە، بۆیە دوای وەسیەت و گەردەن ئازادی خۆیان هەر لەناو تونێڵە تەسك و تاریکەکاندا تەقاندەوە، ئەمەش بە یەکەم کردەوەی خۆ تەقاندنەوە دادەنرێت لە مێژوودا.

لەگەڵ بەردەوامی هەوڵەکانی لەژێر زەمین، بۆ گەیشتن بە ناوجەرگەی شار و بڕینی شوراکان، ئەم جارە عوسمانییەکان دەستیان کرد بە دروستکردنی بورجە گەڕۆکەکان، لە سێ قات و لە دار دروستکرا بوو، ناوەوەی پڕ بوو لە سەرباز و لە شورای قەڵاکان نزیك دەکرایەوە و لەو رێگەوە خۆیان هەڵدەدایە ناو شارەکە.

فاتیح دڵنیا بوو لەوەی قوستەنتینیە بەرەو ڕوخان دەچێت، بەڵام حەزی نەدەکرد لەو زیاتر خوێن بڕێژێت، نامەیەکی بۆ قوستەنتین نووسی و داوای خۆبەدەستەوەدانی لێکردن، لە بەرامبەر ئەمەدا بەڵێنی پارێزراوی سەروماڵی پێدان، بەڵام ئەوان وەڵامیان بەو دایەوە، کە خەڵکەکەی سوێندیان خواردووە، تا دوا هەناسەیان بەرگری لە شارەکە بکەن و ئامادەی خۆ بەدەستەوەدان نین.

لەبەرانبەر ئەمەشدا فاتیح دڵنیای کردنەوە، کە یان وەکو پادشا لە سەرتەختی قوستەنتینیە دادەنیشێت، یاخود گۆڕەکەی لەوێ دەبێت.

کۆبوونەوەی سێیەمیش، کە دوو ڕۆژ پێش فەتحکردنەکە بوو، ئەم کۆبوونەوەیە کۆبوونەوەیەکی یەکلاکەرەوە و چارەنووس ساز بوو، بەڵام دیسان هەمان بۆچوونی کۆبونەوەی دووەم هەبوو سەدری ئەعەزم خەلیل پاشا و بەشێکیتر لە ڕاوێژکاران پێشنیازی بڕیاری کشانەوەیان دا، بەڵام باڵی زانایان، کە مەلا گۆرانی یەکێك بوو لەوان، جەختیان لەسەر بڕیاری یەکەم

کردووه و لەم بارەیەدا سووربوونی خۆیان نیشاندا، مەلا گۆرانی لە هەموویان سوورتر بوو، بۆ ئەوەی سوڵتان بڕیاری پاشەکشەکردن نەدات،گرتنی قوستەنتینیەی بۆ سوڵتان سەلماندووە[1]، زاغانوس پاشاش زیاتر سووربوو لە بەردەوامیدان بە هێرشەکان،بەڵام وەکو وتمان خەلیل پاشا لە دژی ئەوە بوو، بۆیە لەم کاتەدا دەمەقاڵێ و تێکگیران لە نێوان هەردوو لا دا ڕوویدا، سوڵتان ڕووی لە هەر یەکە لە ئاق شمسەدین و مەلاگۆرانی کرد، کە ئاخۆ ئەوان چی دەڵێن لە بارەی بۆچوونەکانی زاغانوس پاشا، ئەوانیش ئەم ڕستەیە دەردەبڕن پێویستە درێژە بدەین بە جەنگەکە ؟ چونکە بە ئامانجی نەمرانە و هەمیشەیی، سەرکەوتن و زاڵبوونمان دەست دەکەوێت. سوڵتان پێشوەخت بڕیاری بەردەوامی خۆی دابوو، بەڵام لە مەعنەویاتی وەزیرەکان دڵنیا نەبوو، کاتێك بیستی بۆچوونی زۆرینە لەگەڵ ئەوەدان، کە کارەکە تەواو بکەن، ئەویش بڕیاری خۆیدا، بەم شێوەیە پاڵپشت بە بڕیاری سوڵتان بڕیاری کۆتاییاندا.[2]

لە کۆتا ڕۆژی پرۆسەی فەتحکردنەکە مەلا گۆرانی و ئاق شەمسەدین لە دوای نوێژی بەیانی لەنێو سەربازەکاندا دەسووڕانەوە و بە گوتاف و موژدەکەی پێغەمبەر (د.خ) ورەی سەربازەکانیان بەرز دەکردەوە، داوای ئارامی و خۆڕاگریان دەکرد، یاخود شەهیدبوون لە پێناوی خوادا، بەڵێنیان دەدا، بەسەرکەوتن، باسی شەهیدەکانی ڕێگای ئەم موژدەیان بۆ سەربازە عوسمانییەکان دەکرد و لە سەرووی هەمووشیانەوە شەهیدی قوستەنتینیە ئەبو ئەیوبی ئەنساری، ڕایانگەیاند کە پێغەمبەری سەروەرمان لە کاتی

---

[1] روهات ئالاکۆم : ل ٢٩

[2] الدكتور محمد مصطفى صفوت : ص ٩٧-٩٨

کۆچی بۆ مەدینە لە ماڵی ئەبو ئەیوبی ئەنساری دابەزی و یەکەم کەس بوو لە مەدینە کە پێغەمبەر (د.خ) میوانی ماڵیان بوو، ئەویش ئێستا ماڵی، واتە (گۆرەکەی ) لێرەیە، بۆیە ناگەڕێینەوە، تا ئەم ئێوارەیە نەبینە میوانی خاوەن ماڵی میوانی پێغەمبەر، ئەم قسەیە گڕی کڵپەی ئاگرینی لە ناخی سەربازەکان بەرز دەکردەوە و جۆش و خرۆشی بۆ شەڕکردن زیادکرد.

لە بەرامبەر ئەمەشدا قەشەکانی نێو شارە گەمارۆدراوەکە، دەستیان کرد بە بەرزکردنەوەی ورەی خەڵك و لەنێو کوچە و کۆڵانەکان دەگەڕان و موژدەی سەرکەوتنیان بەسەر موسوڵمانەکان بە گوێی خەڵکیان دەدا، و دڵنیایان دەکردن کە حەزرەتی مریەم سەرکەوتنیان پێدەبەخشێت.

بەم شێوەیە لە ڕۆژی سێشەمەی ٢٠ جەمادی یەکەمی ساڵی ٨٥٧ ك بەرانبەر ٢٩ مایۆی ١٤٥٣ ز، هێرشی گشتی و یەکلایکەرەوە بۆ سەر شارەکە دەستی پێکرد، پاش ئەوەی وەکو دوو کێو سوپای هەر دوو لا بەیەکیان کێشا و عوسمانییەکان پاڵپشت بە تۆپەکان، لەژێر زەوی و لە دەریایی و لە وشکانی هێرشیان کرد، دوای ئەوەی کوژراوێکی زۆر لە هەردوولا کەوتەوە، لە ئەنجامدا شارەکە کەوت و سەرۆك ئەرکانی گشتی سوپا جوستنیان بە برینداری هەڵات و قوستەنتینی پادشاش کوژرا. بەم جۆرە سوڵتان محەمەدی دووەم نازناوی بوو بە سوڵتان محەمەد فاتیح و توانی بەسەر پشتی ئەسپەکەی و لەگەڵ مەلا گۆرانی و ئاق شمسەدین بڕۆنە ناو شارەکە. یەکەم شوێن کە سەردانی کرد بریتی بوو لە کلیسەی (ئایا سۆفیا)، کە خەڵکێکی زۆر خۆیان تیایدا حەشار دابوو، هەر لەوێ سوڵتان فەرمانی لێبووردنی گشتی بۆ دەکردن و بەمەش سەر، ماڵیان پارێزراو بوو [١].

---

[1] نیقولو باربارو : ص ٤٧



**ساتی چوونی موحەمەد فاتیح بۆ ناو ئەستەنبۆڵ (تابلۆی وێنەکێشی ئیتاڵی زۆنارۆ سەدەی ١٢)**

بەم شێوەیە مەلا گۆرانی لە کوردە یەکەمەکانە، کە پێدەخاتە ناو شاری ئەستەنبۆڵ و تیایدا نیشتەجێ دەبێت.

٢٠ ڕۆژ دوای فەتحکردنەکە، مەلا گۆرانی لەسەر داوای محەمەد فاتیح و بە ناوی ئەوەوە نامەیەك بە زمانی عەرەبی بۆ سوڵتانی مەمالیکی میسر،

(ئینال) نووسیوه، ئەمەش بۆ ئەوه دەگەڕێتەوە، گۆرانی ماوەیەك لەگەڵ سوڵتانەكانی مەمالیكی میسر ژیابوو، باشتر لە زمان و سروشتیان گەیشتبوو،لەگەڵ ئەوەشدا عەرەبێكی ڕەوانی دەزانی، گۆرانی لەو نامەیەدا باسی چیرۆك و قۆناغەكانی فەتحی بۆ سوڵتان كردووه و ڕۆژانی سەختی و ناخۆشییەكانی وێنە كردووه، بەتەواوی لەگەڵ ڕۆحی تێكەڵ بووه، بەشێك لە ناوەڕۆكی نامەكە لە پەرتووكەكەی (ساكیب یڵدز) هاتووه، (محەمەد سەلابیش) كە لە دكتۆر (سالم رەشید)ی گواستۆتەوە، باس لە دەقی هەمان نامەی گۆرانی دەكات، كە بە ناوی سوڵتان محەمەد فاتیحەوە بۆ میسر نێردراوه، لە بنچینەدا نامەكە بە زمانی عەرەبییە، كە نازانین ئەوەی سەلابی هەرتەواوكەری نامەی سەرەوەی یڵدزە، یاخود شتێكی جیاوازە، هەرچەندە زۆر گەڕانمان كرد بۆ دەستخستنی پەرتووكەكەی (سالم ڕەشید) بۆ ئەوەی بزانین ئاخۆ ئەم لە كێی وەرگرتووه، بەڵام نەمانتوانی بیدۆزینەوە، بەڵام ئێمە دەقی ئەو نامەش هەر وەكو خۆی دادەنێین:

( (یەكێك لە چاكترین نەریتی پێشینانمان ئەوەیە كە موجاهیدی ڕێگای خوا بوون، لە لۆمەی لۆمەكاران نەترساون، ئێمەش لەسەر ئەو نەریتە دەڕۆین و لەسەر ئەو ئومێدەش بەردەوامین، پێشڕەوی قسەی خوا دەكەین، كە دەفەرموێت (**قاتلوا الذین لا یؤمنون بالله** ) التوبە:٢٩، پابەندین بە فەرمودەی پێغەمبەر (ص) **(من اغبرت قدماه في سبیل الله حرمه الله علی النار)**، واتە هەركەسێك پێیەكانی لە ڕێی خودادا تۆزیان لێبنیشێت، خودا ئاگری دۆزەخی لێ حەرام دەكات، كە بە فەرمانی خودا

فەرمانی بەسەر داوین ( الذین یلونکم من الکفار) هەروەها سەرباز و موجاهیدەکانمان لە وشکانی و دەریادا ئامادەکردوون بۆ فەتحکردنی شارێك کە پڕ بووە لە خراپە و بێباوەڕی و لەنێو مەملەکەتە ئیسلامییەکانیشدایە و شانازی بە بێباوەڕی خۆشییەوە دەکات و کەش و فش دەکات

**کانها حصف علی الخد ال وکانها کلف علی وجه القمر**

ئەو شارەی لایەکی لەسەر دەریایە و لایەکەی تریشی لەسەر وشکانییە، ئێمەش هەروەك خوا فەرمانی پێکردووین، خۆمان ئامادە و سازکردووە (وأعدوا لهم ما استطعتم من قوة)، هەموو تفاقێکیش کە هێرشی پێ بکرێت و هەموو چەکێك کە پشتی پێ دەبەسترێ، چ ئەوەی ڕووناکی بداتەوە و ئەوەی بگرمێنێ هەروەها مەنجەنیق و بیر هەڵکەن و دیواری کونکەر و هی تریش، کە لە وشکانییدا کەڵك بگرێ، لەگەڵ کەشتییە بارهەڵگرەکان و ئەوانەی وەك بەیداخ هاتووچۆ دەکەن، هەموو ئەمانەمان ئامادەکردوون، لە ٢٦ ی رەبیعی یەکەم ساڵی ٨٥٧ ك، دا دابەزینە ناو شارەکە.

**فقلت للنفس جدی الان فاجتهدی وساعدینی فهزا ما تمنیت**

ئەمانە هەر کات بانگ بکرایە، بۆ ڕاستی لووتیان بەرز دەکردەوە و لەسەر بێباوەڕی بەردەوام دەبوو، خۆیان دەبردە ریزی بێباوەڕان، ئێمەش بە تەواوی گەمارۆمان دان و جەنگمان لەگەڵدا کردن، ئەوانیش جەنگیان لەگەڵمان کرد، لێمان کوشتن و لێیان کوشتین، و ٥٤ شەو و ڕۆژ جەنگ لە نێوانمان بەردەوام بوو.

**اذا جاء الله و الفتح هيَن**

**على المرء معسور الآمور و صعبها**

ئینجا له ڕۆژی ٣ شه‌ممه‌ی جه‌مادی یه‌که‌مدا گزنگی ڕاستی هه‌ڵهات و ئێمه‌ش له‌و کاته‌دا به وێنه‌ی ئه‌ستێره‌کان تیربارانی سه‌ربازانی شه‌یتانمان کرد و هێرشمان کردنه سه‌ر، حوکمی سدیقی (ئه‌بو بکر) به‌به‌ره‌که‌تی فاروقی (عومه‌ر) به‌لێدانی حه‌یده‌ری (عه‌لی)ئالی عوسمان ئاماده‌ی کرد، خوای گه‌وره‌ش پێش هه‌ڵاتنی خۆر له خۆرهه‌ڵاته‌وه به‌و فه‌تحه منه‌تی خۆی به‌سه‌رماندا (سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ ( (45بَلِ السَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَالسَّاعَةُ أَدْهَى وَأَمَرُّ)، یه‌که‌م که‌سیش،که کوژراو سه‌ری لێکرایه‌وه، سه‌رکرده سپڵه نه‌فرین لێکراوه‌که‌یان بوو، به‌مه وه‌ك گه‌لی عاد و سه‌مود له‌ناوچوون و فریشته‌کانی سزا چوارده‌وره‌یان دان و ئاگریان به‌سه‌ریاندا باراندن، سه‌رئه‌نجامێکی خراپیان تووش بوو، ئه‌وه‌ی کوژرا کوژرا، ئه‌وه‌شی مایه‌وه، به دیل گیرا، ئینجا تاویاندا بۆ لای خه‌زێنه‌کانیان و زێڕ و زیوه‌کانیان ده‌رهێنان، به‌مه‌ش بارودۆخێکیان به‌سه‌ردا هات، که ناویان نه‌ما. (فقطع دابر القوم الذين ظلموا والحمد لله رب العالمين)، ئه‌و ڕۆژه باوه‌ڕداران دڵخۆش بوون به‌و سه‌رکه‌وتنه خواییه، جا که‌وتین به‌سه‌ر ئه‌و پیس و گڵاوه دۆڕاوانه‌دا و ئه‌و بازنه و ناوچانه‌مان پاککردنه‌وه و قه‌شه و خاچپه‌رست و زه‌نگه‌کانمان له جێ بانگی موسوڵمانان ده‌رکردن، په‌رستگای بت په‌رسته‌کانمان به مزگه‌وتی داروده‌سته‌ی ئیسلام گۆڕی،

ئەو نەخشەیە بەهۆی دراو و وتاردانەوە سەرپەرشتی کرا، بەمەش فەرمانی خوایی هاتەدی و ئەوەی ئەوان دەیانکرد، پوچەڵ بوویەوە [1].

مەلا گۆرانی تەنها نامەیەکی ڕووتی بە پۆستە بۆ سوڵتانی مەمالیك نەنارد، بەڵکوو جیاوازتر لە نامەکانیتر، لەگەڵ دەقی نامەکە، کە بەدەست و خەتی خۆی نووسی بووی، دوو دیلی شاری قوستەنتینیەش لەگەڵ پۆستەچیەکە دەنێرێت بۆ سوڵتان، ئەمەش بۆ ئەوە بوو، تا موژدەی سەرکەوتنەکە تەنها بە شێوەیەکی نووسین نەبێت، بەڵکوو بە شێوەی کردارەکی سوڵتان بەرهەمی ئەو سەرکەوتنە بنێرێت، تەغری بەردی ئەوکاتە لە مەجلسی سوڵتانی مەمالیك دەبێت، کاتێك نامەکەی گۆرانی و دوو کەسە دیلەکە دەگەنە کۆشکی سوڵتان، بۆیە دەڵێت:سوپاس و منەت بۆ خوایە لەسەر ئەو فەتحە گەورەیە، ئینجا نێردراوی ناوبراو هات و دوو دیلی لە گەورەکانی ئەستانبوڵی پێبوو، کە هێنانی بۆ لای سوڵتان (ئینال) سوڵتانی میسر. ئەو دووانە هەردووکیان خەڵکی قوستەنتینیە بوون، کە گەورەترین کەنیسەی ئیستانبول بوو، سوڵتان زۆر دڵخۆش بوو، خەڵکیش بەو فەتحکردنە گەورەیە سەرسام بوون، تەپڵی خۆشیی لە شاردا لێدرا، بەو هۆیەوە چەند ڕۆژێك قاهیرە ڕازێنرایەوە. پاشان لە ڕۆژی ٢ شەممە ٢٥ ی شەوالدا نێردراوەکە لەگەڵ دوو دیلەکەی بەردەستی پاش ئەوەی بە کۆڵانەکانی شاردا تێپەڕبوون بۆ قەڵا چوون، خەڵکی بە جوانکردنی دوکان و شوێنەکان ئاهەنگیان دەگێڕا، لەم مەبەستەشیاندا چوست و چالاك بوون، سوڵتانیش لە قەڵای جەبەلی حەوشەی کۆشکی سوڵتانیدا

---

[1] صلابی : ص ١٨٩-١٩٠

خزمەتگوزاری خستە ڕوو[1]. لە کاتێکدا تەغری بەردی بێئاگا بوو لەوەی، کە نووسەر و داڕێژەری ئەم نامەیە هەمان ئەو پیاوەیە کە بە زمان درێژ ناوی بردبوو، کە چەند ساڵێکی کەم بەر لە ئێستا شار بەدەریان کرد.! ئەوەی زیاتر ئەم خۆشی و جۆشیەیدا بە خەڵکی میسر، بەهێزیی ناوەڕۆکی نامەکە بوو، کە وێنەیەکی تەواوی شەڕەکەی بۆ دەسەڵاتدارانی مەمالیك کردبوو، وەك ئەوەی خۆیان بە کرداری لەناو شەڕەکە بەشدار بووبن.

## ٢.٢٠:ناردنی مەلا گۆرانی بۆ شاری بورسە:

لە دوای فەتحکردنی شارە موژدەپێدراوەکە، محەمەد فاتیح پایتەختی دەوڵەتی عوسمانیی لە ئەدرنەوە دەگوازێتەوە بۆ شاری قوستەنتینیە و بە دوایدا ناوەکەی دەگۆڕێت بۆ شاری ئەستەنبۆل (ئیسلام بۆڵ)، لەگەڵ خۆشی هەموو یەکە کارگێڕیی و ئیدارییەکان دەگوازێتەوە بۆ پایتەختی نوێ، چەندین مزگەوت و قوتابخانەی نوێ لە شارەکە دەکاتەوە، مەلا گۆرانیش وەکو هەموو بەرپرسی یەکە ئیدارییەکانی تر، هەر لەو شارە لەسەر پیشە کۆنەکەی خۆی، واتە دادوەری گشتی سوپا بەردەوام دەبێت، فاتیح دوای وەرگرتنی شانازی موژدەکەی پێغەمبەر (د.خ) هێندەیتر خۆی بە قەرزاری مەلا گۆرانی دەزانی، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ خۆشەویستی بۆ گۆرانی زیاد دەبێت، نەك وەکو سوڵتان، بەڵکوو هەر وەکو مامۆستا و قوتابی سەیری دەکرد، گۆرانیش هەمیشە لە نزیکەوە

---

[1] تغري بردي : مجلد ١٦ ، ص ٧٢-٧٣

چاودێری کارەکانی فاتیحی دەکرد و بەردەوام ڕێنمایی و ئامۆژگاری پێدەبەخشی، بەڵام ئەو نزیکبوونەوەیە نێوانیان هەر وا بەئاسانی نەدەڕۆیی، بەڵکوو کەسانێك هەبوون خۆش نود نەبوون، بە نزیکبوونەوەی مەلا گۆرانی لە فاتیح، ئەم کارەیان لەسەر حسابی خۆیان دەزانی، هەرچەندە گۆرانی زۆر خۆی دوور دەگرت، لەو کێشمەکێش و ملمەلانێیەی لەسەر پلەو پۆست و پایە دەکرا، بە بەڵگەی ئەوەی لە ڕۆژانی هاتنە سەر تەختی فاتیح، کاتێك داوای لە مەلا گۆرانی کرد ببێتە وەزیر، بەڵام گۆرانی ئەمەی ڕەتکردەوە، ئەم قبووڵنەکردنەش لەبەر بێتوانایی مەلا گۆرانی خۆی نەبوو، بەڵکوو نەیدەویست پیاوانی دەوری محەمەد فاتیح لە خۆی بکاتە دوژمن، چونکە دەیزانی ئەمانە چەند کەسانێکی ماستاوچی و نەفس نزمن، لە پێناوی پۆستوپایە ئامادەن هەموو شتێك بکەن.

دوای پرۆسەی فەتحکردنەکە، محەمەد فاتیح بۆی دەرکەوت، کە کێ دڵسۆزە و کێ بەرژوەندخوازە، بۆیە دەستی کرد بە چاکسازی بەردەوام، یەکەم کەسیش ئەم چاکسازییە گرتییەوە، بریتی بوو لە کەسی دووەمی وڵات (چاندارڵی خەلیل پاشا)، کە پلەی سەدری ئەعزەمی هەبوو لەگەڵ هاوبیرەکانی، کە لە کاتی فەتحکردنەکەدا زۆر پێداگیریان لەسەر کشانەوەی هێزی عوسمانی دەکرد، بە تایبەت چاندارڵی خەلیل پاشا کە بۆ ئەم کارەشی زۆر پێداگیری دەکرد و بە سەرئەوانەی ترەوە دەنگی بەرز دەکردەوە، بە وەرگرتنی بەرتیل تاوانبار کرا، بۆیە فاتیح بەم بیانووە لە پیشەکەی دووری خستەوە، پێش ئەوەی چاندارڵی خەلیل پاشا دەستی بکات هەر زەرەر و زیانێك، بە فەرمانی سوڵتان خرایە زیندانەوە. هاوکات ئەوانەشی کە پێداگیریان لەسەر بەردەوامی پرۆسەی فەتحەکە

دەكردەوە، كە بريتيبوون لە پياوانی ئايينی، سولّتان هەموويانی لە خۆی نزيككردنەوە، پلە و پايەی زياتری پێبەخشين. بەڵام ئەو پلە و پۆستانەيان بەردەوام نەبوو ؟ چونكە لەو كاتەدا ڕووداوێكی چاوەڕواننەكراو و كتوپڕ ڕوويدا، ئەويش كوژرانی چاندارلّی خەليل پاشا بوو لە ڕووداوێكی تەمومژاويدا.بەرپرسياريەتی كوشتنەكەش خرايە ئەستۆی ئەم كۆمەڵە كەسە، بە بيانووی ئەوەی لە كاتی ڕووداوی فەتحكردنەكە دەمە قاڵێ و ڕووبەڕووبوونەوەی توند لە نێوان ئەم دوو بەرە جياوازە ڕوويدابوو، هەر يەكەو بە بيانوويەك دوورخرانەوە، سەرەتا زاغانۆس پاشا لە مانگی سەفەری ساڵی ٨٥٩ ك شوباتی ١٤٥٥ ز لە پۆستەكەی لادەبرێت و دوور دەخرێتەوە بۆ دەرەوەی ئەستەنبۆل و مەحمود پاشا دێتە شوێنی،كە بە گوێرەی بەرواری ئەو بەڵگەنامەيە بێت كە بڕياری دامەزراندنی مەحمود پاشايە لە شوێنی زاغانۆس پاشا، ئەوە ئەو بەروارەی سەرەوەمان بۆ پشت ڕاست دەكاتەوە كە زاغانۆس پاشاش لەو بەروارەدا دوورخراوەتەوە، مەلا گۆرانيش ناوی هەر لەگەڵ ئەم كۆمەڵەدابوو، واتە مەلا گۆرانی تا ساڵی ١٤٥٥ ز ٨٥٩ك لە ئەستەنبۆڵ نيشتەجێ بووە، ئەو دەستە نوێيەی كە پلە وەردەگرن، نايانەوێت مەلا گۆرانيش لە نزيك سولّتان بمێنێت ! چونكە ئەمان وايان دەبينی مەلا گۆرانی بەشێكە لەو كۆمەڵەی پێشووتر، بۆيە كەوتنە دروستكردنی بڕ و بيانوو، تا بەو هۆيەوە بتوانن دووری بخەنەوە، سەرئەنجام بيانوويان دەستكەوت و تۆمەتێكی سەيريان بۆ هەڵبەست، ئەويش ئەوە بوو گوايە مەلا گۆرانی دەسەڵاتەكەی خراپ بەكاردێنێت، بەبێ حيساب كردن و گەڕانەوە بۆ سولّتان خەڵك لە كاروباری دادگا دادەمەزرێنێت، گوايە سولّتانيش بەم كارەی زانيوە، بەڵام بەهۆی ئەو پەيوەندييە پڕ ڕێزو

شکۆیەی لە نێوانیاندا هەبووە، شەرمی لە مەلا گۆرانی کردووە  و ئەم بابەتەی لەگەڵ باس نەکردووە، بەڵام  کاتێك ئەم پڕوپاگەندەیە بڵاو دەبێتەوە، سوڵتان ناچار دەبێت لە کۆشك دەکەوێتە ڕاوێژ بە وەزیرەکانی، دەربارەی ئەم کارەی مەلا گۆرانی. وەزیرکان و ئەو باڵەی تازە هاتبوونە سەر دەسەلات،پێشنیازی دوورخستنەوە و کەمکردنەوەی دەسەڵاتی مەلا گۆرانی بۆ سوڵتان دەکەن، سوڵتان نایەوێت مامۆستاکەی بەو ڕەهاییە دوور بخاتەوە، لەبەر ئەوە بەو پەڕی رەوشت بەرزییەو  بە مەلا گۆرانی دەڵێت:بیستوومە زەوییە وەقفەکانی باپیرم لە شاری بورسە تووشی تێکەڵی و کێشەیەکی زۆر هاتووە، کاتێك سوڵتان ئەم وتەییەی بە مەلا گۆرانی ووت، ئەویش وەڵامی دایەوە:ئەگەر فەرمانم پێدەدەیت بۆ ئەم کارە، ئەوە چاکسازی تیادا دەکەم، سوڵتانیش وتی ئەم کارەت ماوەیەکی زۆر دەخایەنێت، لەگەڵ ئەم کارەشیدا دادوەری شاری بورسەشی پێدەدا.[١]
بەمەش  دەسەڵاتی مەلا گۆرانی تەنها وەکو دادوەرێکی ڕووت دەمێنێتەوە.هەرچەندە مەلا گۆرانی ڕەزامەندی لەسەر ئەم پۆستە نوێیانەی دەردەبڕێت، بەڵام  هەر زوو لەوە دەگات، کە ئەمەی سوڵتان لەگەڵی کردووە، سەرەڕای ئەوەی لێدانە لە کەسایەتی ئەم، وە لەهەمان کاتیشدا باوەڕکردنە بەو تۆمەتە، بۆیە بەلایەوە زۆر قورس بوو لەوەی کە تۆمەتێکی لەو جۆرەی بۆ هەڵبەسترا.

---

[١] گاشکبری زادە ، ص ٥٢

## ٢. ٢١: تێکگیرانی مەلا گۆرانی لەگەڵ سوڵتان:

دوای نیشتەجێکردنی گۆرانی لە شاری بورسە، ساردییەك دەکەوێتە نێوان ئەو و محەمەد فاتیح،ئەم ساردییەی مەلا گۆرانیش لە فاتیح لەبەرئەوە نەبوو، کە لە پلە و پایەی کەمکراوەتەوە، چونکە گۆرانی وەك لە پێشووتردا باسمان کرد، باکی بە پلەی وەزیر نەبوو، چ جای دادوەری گشتی سوپا، بەڵام بەلایەوە زۆر شتێکی نامۆ بوو، دوای ئەوەی پێنچ ساڵ لە بەڕێوەبردنی ئەرکی دادوەری گشتی سوپا کە بەوپەڕی دڵسۆزیی و ماندوونەناسی بەڕێکرد، تەنانەت لە کاتی فەتحەکەشدا زیاد لە ئەرکەکەی خۆی کاری دەکرد، ئەمە جگە لەوەی، ساڵانێکی زۆر خزمەتی بە دەوڵەتی عالی کردووە، کەچی ئێستا سوڵتان باوەڕ بە جۆرە تۆمەتێکی وەها بکات، مەلا گۆرانی چەند مانگێك لە شاری بۆرسە لەگەڵ کاری دادوەری خەریکی رێکخستنی زەوییە وەقفەکانیش دەبێت، ڕووداوێکی ناخۆش دەکەوێتە نێوان ئەو و سوڵتانەوە، ڕووداوەکە بەم شێوە دەبێت، ڕۆژێك سوڵتان محەمەد فاتیح نامەیەك بە دەستنووسی خۆی، کە پەیوەستە بە کاروباری دەوڵەت بە پۆستەچییەك بۆ دادگای شاری بۆرسە دەنێرێت، کە وا دەبینرا نامەکە فەرمانێکی گشتی بووبێت. لەو کاتەی نامەکە دەگاتە دەستی مەلا گۆرانی، دوای خوێندنەوە و تێڕامان، دەبینێت ئەو فەرمانەی کە سوڵتان دەریکردووە، پێچەوانەیە لەگەڵ ناوەڕۆکی شەریعەتی ئیسلام، هەر بۆیە مەلا گۆرانیش کاردانەوەی توندی دەبێت، بەرانبەر فەرمانەکە و تووڕە دەبێت،نامەکە دەسووتێنێت یاخود دەیدڕێنێت، تۆڵەی لادانە شەرعیەکەی سوڵتانیش لە پۆستەچیەکە دەکاتەوە، دوای لێدانی دەیخاتە زیندانەوە. کاتێك ڕووداوی ئەم هەواڵە بە سوڵتان دەگاتەوە، بڕیاری لادانی مەلا گۆرانی لە هەردوو پۆستەکەی دەدات.

## ٢٢,٢:جێهێشتنی ئەنادۆڵ و ڕووکردنە قودس و بەجێهێنانی فەریزەی حەج:

سوڵتان محەمەد فاتیح لە ژێر کاریگەری ڕاوێژکارەکانی، بڕیاری گۆشەگیرکردنی مەلا گۆرانییدا، هاوکات دایبڕی لە هەموو پلەو دەسەڵاتێك.ئەگەرچی مەلا گۆرانی توانی چاوپۆشی لەو تۆمەتانە بکات، کە بە ناڕەوا دەیانخستە پاڵی، بەو هۆیەشەوە پایەکەی نزم بووەوە، بەڵام هەرگیز نەیدەتوانی بەرانبەر هەر سەرپێچییەکی شەرعی خوا بێدەنگ بێت، جا لەلایەن هەر کەسێکەوە بووایە، هەر ئەم هۆیەش وای لە مەلا گۆرانی کرد، لە ژیانیدا چەندین جار باجی ئەم هەڵوێستانەی بدات، لەگەڵ ئەوەشدا بیری لە سەرئەنجامەکەی نەدەکردەوە و بێباك بوو لەوەی هەرچی بەسەریدا دەهات. هەرچەندە سەرچاوەکان هیچ ئاماژەیان بەوە نەکردووە، کە فاتیح فەرمانی دەرکردن یاخود دورخستنەوەی مەلا گۆرانی دابێت دوای ئەم ڕووداوە، بەڵام گۆرانی بڕیاری جێهێشتنی ئەنادۆڵ دەدات. ئەم بڕیارەی مەلا گۆرانی ڕەنگە لەو بێزارییە هاتبێت کە بەسەریدا هات و بەتایبەتی پاش ئەوەی سوڵتانیش بەرگری لیّ نەکرد. پرسیار ئەوەیە کە ئێستا گۆرانی خاوەنی هیچ دەسەڵات و پلەیەك نییە و تەنانەت ناتوانیّ وەکو مامۆستاش وانە بڵێتەوە، کەواتە ئیشی لەو شارە چییە ؟ ئێستا تەمەنی بۆتە چل و شەش ساڵ و ماوەی چواردە ساڵە پێی خستۆتە ناوچەی ئەنادۆڵ، ئەم ماوەیەش ژیانی تەنها لەنێو قوتابخانەکان و دادگا و کێشەی خەڵك بردۆتە سەر، لە تەمەنی منداڵییەوە چاوی بە کەس و کارەکەی نەکەوتووە و تاکە هەواڵێکیشی لێیان نییە. ئەم ژینگەیە بێزاریی زۆر لای مەلا گۆرانی

دروست دەکات، بۆیە بەبێ گەڕانەوە بۆ لای سوڵتان، بڕیاری جێهێشتنی ژێر سایەی دەسەڵاتی عوسمانیی دەدات و ڕوو لە قودس دەکات.

ئاخۆ بۆچی دەبێت مەلا گۆرانی ڕووی لە شارەزووری زێدی باوباپیرانی نەکردبێت ؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە بۆ ئێمە کەمێك قورسە، چونکە هیچ سەرچاوەیەك یاخود ئاماژەیەك یارمەتیمان نادات، تا بتوانین وەڵامێکی دروست بدەینەوە، بەڵام ئەگەر گریمانەیەك لەو بارەیەوە بە خەیاڵمان دابێت، ئەوەیە ئەو کاتە شارەزوور نزیکترین شوێن بووە لە دەسەڵاتی محەمەد فاتیح، گۆرانیش نەیویستووە لەژێر سایەی سوڵتاندا بژییێت، بۆیە ڕووی لە شارەزوور نەکردووە. ئەی کەواتە بۆچی قودسی هەڵبژارد ؟ دیسان ناتوانین وەڵامێکی دروست بدەینەوە، بەڵام دەتوانین وەکو گریمانە هەڵبژاردنی قودس بۆ چەند هۆکارێك بگەڕێنینەوە، ئەوانیش:

- دووریی جوگرافیای شوێنەکە لە دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی.
- مەلا گۆرانی سەرەڕای زیرەکی و لێهاتوویی لە بواری زانست، لەهەمان کاتیشدا پیاوێکی زۆر خواپەرست بووە، نەیویستووە لایەنی رۆحی فەرامۆش بکات،بۆیە ویستوویەتی لە تەمەنی خۆیدا ژیانێکی گۆشەگیر هەڵبژێرێت و لەهەمان کاتدا فەریزەی حەج بەجێ بهێنێت.
- بە فرسەتی زانیوە لەڕێگای چوونە قودس و حیجاز، چاوی بە زانایانی سەردەمی خۆی بکەوێت، تا لەو ڕێیەوە ئاگاداری بەرهەمەکانیان بێت و سوودیان لێ ببینێت بۆ نووسینی بەرهەمەکانی.
- چونکە مەلا گۆرانی لە هەمان کاتدا پیاوێکی ئایینی و سیاسی بووە، بۆیە ویستوویەتی لە هەواڵی دەوڵەتانی دەوروبەری ئاگادار بێت، تا بزانێ لە جیهانی ئیسلامی چی دەگوزەرێت.

له کۆتایی ساڵی  ٨٥٩ ك  ١٤٥٥ ز، مەلا گۆرانی بۆرسه بەجێ دەهێڵێت، له بارەی ئەوەی ئایا گۆرانی له سەرەتادا ڕووی له کوێ کردووه، سەبارەت بەوه  سەرچاوه عەرەبییەکان و تورکییەکان ڕایان جیاوازه، تاشکۆپەری زاده ئاماژەی بەوه کردووه، که مەلا گۆرانی دوای جێهێشتنی شاری بۆرسه، ڕوو له قاهیرەی پایتەختی مەمالیك دەکات.

پوختەی گێڕانەوەکەی بەم شێوەیە:دوای ئەم ڕووداوه، مەلا گۆرانی ڕووی له شاری قاهیره کرد، لەو کاتەدا سەردەمی فەرمانڕەوایی قاتیبای بوو، ئەویش کاتێك مەلا گۆرانی دێته قاهیره، سوڵتان زۆر ڕێزی دەگرێت و ماڵ و سامانێکی زۆر به مەلا گۆرانی دەبەخشێت، ژیانێکی شکۆمەندانەی بۆ فەراهەم دەکات، مەلا گۆرانیش خەریکی خوێندن و نووسین دەبێت، دواتر سوڵتان محەمەد فاتیح که دەزانێ گۆرانی له قاهیره لەژێر سایەی مەلیك قاتیبای نیشتەجێیه، نامەیەك بۆ مەلیك دەنووسێت، و داوای لێدەکات مەلا گۆرانی بنێرێتەوه بۆ ئەستەنبۆل، ئینجا دوای ئەوەی مەلیك) قاتیبا)ی نامەکه بۆ مەلا گۆرانی  ئاشکرا دەکات و ڕاستەوخۆ پێی دەڵێت:مەچۆ بۆ لای محەمەد فاتیح، من زیاتر له ئەو ڕێزی تۆ دەگرم، گۆرانیش وتی ڕاسته، بەڵام  له نێوان من و ئەودا خۆشەویستییەکی گەوره هەیە،وەك ئەو خۆشەویستییەی، که له نێوان باوك و کوڕدا هەیە، ئەوەشی  که له نێوانمان ڕوویدا، شتێکیتره و ئەو لێم تێدەگات  و دەزانێ بەردەوام دڵم لایەتی، جا ئەگەر نەچم دەزانێ بەهۆی تۆوەیە و بەمەش دوژمنایەتی دەکەوێته نێوانتانەوه، قەتیبای مەلیك ئەو بۆچوونەی بەباش زانی و ماڵێکی زۆری پێدا و هەموو پێویستییەکانی سەفەرکردنی بۆ ئامادەکرد، سەرەڕای ئەمەش چەند دیارییەکی گەورەشی لەگەڵدا نارد بۆ سوڵتان محەمەد فاتیح. کاتێك

مەلا گۆرانی گەیشتە قوستەنتینیە محەمەد فاتیح بۆ جاری دووەم بە دادوەری شاری بۆرسە دایمەزراند، ئەمەش لە ڕێکەوتی ٨٦٢ ک [1].

ئەم گێڕانەوەی کۆپەری زادە سەرەڕای ئەوەی چەند کەموکووڕییەکی تێدایە، هەمان کاتیشدا پێچەوانەیە لەگەڵ چەند وێستگەیەکی ژیانی مەلا گۆرانی، لە ڕاستیدا ئێمە ئەگەر سەرچاوەی کۆنتر لە ژیانی کۆپەری زادەمان لا نەبووایە، ئەوە ئەوکات ناچار دەبووین پەنامان بۆ پەرتووکەی ئەم دەبرد، بەڵام ئێمە نەك هەر ئەو سەرچاوانەمان بەردەستن کە باس لە شوێنی تری جگە لە میسر دەکەن، بەڵکوو بەڵگەی ئەوانەشمان لایە، کە بە چاوی خۆیان مەلا گۆرانییان بینیوە و گفتوگۆیان لەگەڵدا کردووە، مەبەستمان لە هەردوو زانا سەخاوی و بوقاعییە.

بەر لەوەی بچینە نێو لاپەڕەکانی پەرتووکی سەخاوی و بیقاعی، دەبێت چەند هەڵسەنگاندنێك بۆ باسەکەی کۆپەری زادە بکەین:

- کۆپەری زادە لەبارەی ئەو مەلیکەی، کە پێشوازی گەرمی لە مەلا گۆرانی کردووە، ناوی بە (قاتیبایی) هێناوە، لە ڕاستیدا ئەم مەلیکەی دەوڵەتی مەمالیك لەنێوان ساڵانی١٤٦٨–١٤٩٦ ز، حوکمی کردووە، دەرچوونی گۆرانی لە بورصەو تا گەڕانەوەی سێ ساڵی خایاندووە واتە لە ساڵی ١٤٥٥ ز تا ١٤٥٨ ز، کەواتە دە ساڵی تر پێویستە چاوەڕوانبین، تا حوکمی دەسەڵاتی قاتیبای دەستپێدەکات. لەڕاستیدا ئەو سەردەمی حوکمی مەمالك بوو ماوەی فەرمانڕەوایی مەلیك ئەشرەف سەیفەدین ئینال علائی ١٤٥٣–١٤٦٠ ز.

[1] ص ٥٢– ٥٣

- له حاڵەتی ئەوەی کە مەلا گۆرانی ڕووی لە میسر کردبێت، ئەوە بێ گومان مێژوونووسانی ئەوکات ئاماژەیان بەم ڕووداوە دەکرد بە تایبەتی مێژوونووسێکی وەکو تەغری بەردی کە ئامادەی بەشێك لە کۆڕەکانی مەمالك بووە، وە ئەوانەشی کە بیستوویەتی لە پەرتووکە ١٦ بەرگییەکەی تۆماری کردووەن، بەڵام بە هیچ جۆرێك باسی لەو هاتنەی مەلا گۆرانی نەکردووە بۆ قاهیرە[1].
- مەلا گۆرانی ڕابردوویەکی تاڵی لەگەڵ زانا حەنەفییەکانی قاهیرەدا هەبووە، نەیدەویست جارێکیتر خۆی تووشی ملمەلانێیەکیتر بکاتەوە، ماوەیەکی زۆر سەرقاڵی کاری دادوەرەی و مقۆمقۆی سیاسی بووە، تاقەتی بەرپرسیارێتی نەبووە، دەیویست دەست بە نووسینی بەرهەمەکانی بکاتەوە، بۆیە لە شوێنێك دەگەڕا، کە لە ملمەلانێی سیاسی دووربێت.

سەبارەت بە سەرچاوە عەرەبییەکان، سەخاوی و بیقاعی بە هەردووکیان گەشتێکی دووری مەلا گۆرانی تەواو دەکەن، بەم شێوەیە:ئەوکاتەی مەلا گۆرانی شاری بۆرسە بەجێدەهێڵێت، سەخاوی لە حەلەب نیشتەجێبووە، وا دەگێڕێتەوە، کە مەلا گۆرانی لە ساڵی ٨٥٩ك هاتۆتە ئەم شارە، پێناچێت مەلا گۆرانی زۆر لە حەلەب مابێتەوە، چونکە هەر سەخاوی دەڵێت، دوای ئەوە حەلەبی جێهێشتووە ڕووی لە شام کردووە، [٢] بەڵام لێرە بەدواوە سەخاوی زانیارییەکانی لە بیقاعی وەردەگرێت، ئاماژە بەوە دەکات، کە بیقاعی لە ساڵی ٨٦١ك کاتێك لە

---

[1] سخاوی ، ص ٢٤٢ ، البقاعی ، ص ٦٣

[2] YILDIZ ; S 65

حیجاز دەبێت بەمەبەستی بەجێهێنانی فەریزەی حەج،بەڵام بەرلەوەی مەلا گۆرانی بچێتە حەج، لە ساڵی ٨٦٠ ك ١٤٥٦ ز لە قودس دەمێنێتەوە، لەم ماوەیەدا لە مزگەوتی) ئەقسا) لە کونجی ژوورێکدا دەست دەکات بە نووسینی چەند بەرهەمێك، یەکێك لەوانە بریتییە لە ڕاڤەی پەرتووکی (جمع والجوامع)، لە ٢ ی رەجەبی ٨٦١ – ٢٦ مایسی ١٤٥٧ ز، لە نووسینی ئەم پەرتووکە دەبێتەوە. هەر لەوێش دەست بە نووسینی تەفسیری قورئانی پیرۆز دەکات. لەوێدا بوقاعی چاوی بە مەلا گۆرانی دەکەوێت، وەکو ئەوەی سەخاوی ئاماژەی بۆ کردووە، پێدەچێت زووتر ئاشنایەتی لە نێوان ئەم دوو زانایە هەبووبێت، هەرچەندە بیقاعی خۆی ئاماژەی بەو کاتە نەکردووە کە تیایدا مەلا گۆرانیی ناسیوە، بەهەرحاڵ کاتێك مەلا گۆرانی چاوی بە بیقاعی دەکەوێت، دوای هەواڵ پرسینی لە بارودۆخی ئەنادۆڵ، پەرتووکێکی خۆی پێ دەدا تاوەکو لە ناوچەی ئەندۆڵ بلاوی بکاتەوە. بیقاعی چەند دێڕێکی لە قەسیدەکەی مەلا گۆرانی هێناوە، کە تیادا ستایشی سوڵتان محەمەد فاتیح دەکات:

لَميَا اذا أسْفَرَتْ عن ثغرها الشَّنب

سارت بلبی، وأسْرَی بعده أرّبی

ومنها:

فهذه حالتی بالعین تنظرها:

القلبُ في صَفَد، و العین في حلبِ

فسرتُ مختفیا، والدهر یتبعنی

عساه یًنصفنی من جورها (جَلبِی)

سلطانًّنا الباهر الباهی له شرف

يسمو على البدر و الجوزاء و الشهبِ

ومنها:

رد الحشاشةَ في الإسلام بعد شفا

بسيفه العاضِب اللَماعِ ذى الشّطبِ

يجرّهم كوحوش البِيد إذْ قِدمَتْ

ترَجو قِراك، وذا مِنْ أقربِ القربِ

ومنها:

محةمةد:أنت فخرُ القوم قاطبة

سميّ بَدْرٍ سما من أنْجُم العربِ

ومنها:

رياض مدحك أزهاَرُ مفتحة

وصوت شعِرى لها كالبُلبل الطَّربِ

وآخرها:

لك البقاء مدى الأيام فوق عُلاً

وضدَّك الأبتر المخذول فى نصبِ[1]

سەبارەت بەوەی کێ لە بابەتی ئاشتەوایی کردنی نێوان مەلا گۆرانی و محەمەد فاتیح دەستپێشخەر بووە، سەرچاوەکان بەرچاوڕوونییەکی وەهایان نەداوە، ئەگەر بەگوێرەی بۆچوونی یەکەم بێت، کە تاشکۆپەری زادە باسی کردووە، ئەوە دەبێت محەمەد فاتیح دەستپێشخەری کردبێت.

---

[1] البقاعی : ص ٦٣-٦٤

بەخێرایی پەشیمان بۆتەوە و نامەی بۆ سوڵتانی مەمالیك نووسیوە و داوای ناردنەوەی مەلا گۆرانیی کردووە، بەڵام بەو پێیەی ئێمە چوار بەڵگەی بەهێزمان خستە ڕوو کە مەلا گۆرانی دوای جێهێشتنی شاری بۆرسە نەچۆتە میسر، بەڵکوو هاتۆتە قودس و حیجاز، بۆچوونی دووەم تەواو پێچەوانەی یەکەمە، واتە مەلا گۆرانی خۆی نامەی بۆ سوڵتان محەمەد نووسیوە، وە هەستی خۆشی بۆ سوڵتان بە قەسیدەیەکی درێژ و هەست بزوێن دەربڕیوە و کەوتۆتە مەدح و سەنای سوڵتان، بۆیە سوڵتانیش سۆز و غوربەتی بۆ دووریی مەلا گۆرانی جووڵاوە و هەستی بەوە کردووە، کە قەرزاریەتی، ڕاستەوخۆ نامەیەك بۆ مەلا گۆرانی دەنووسێت، لە حیجازەوە داوای گەڕانەوەی لێدەکات بۆ ئەنادۆڵ، مەلا گۆرانیش دوای ئەوەی نامەکەی بە دەست گەیشت، هەر بەخێرایی و بەبێ ئەوەی کات بە فیڕۆ بدات، دووبارە بۆ ئەنادۆڵ دەگەڕێتەوە.

## ٢. ٢٣:ئاشتبوونەوەی مەلا گۆرانی و محەمەد فاتیح و دووبارە نیشتەجێ بوونی لەبۆرسە :

دوای ئەوەی مەلا گۆرانی لەگەڵ سوڵتان محەمەد فاتیح کەوتە ئاشتەوایی کرد بە ڕەزامەندی دەربڕینی سوڵتان بڕیایدا بگەڕێتەوە بۆ ئەنادۆڵ، ئەمەش ڕێکەوت بوو لەگەڵ ٨٦٢ ك ١٤٥٨ ز. دیاری کردنی ئەم ساڵەش گوێرەی سەخاوی بێت، مەلا گۆرانی لە کۆتاییەکانی ٨٦١ ك فەریزەی حەجی بەجێهێناوە، چەند مانگێك دوای ئەمەش نامەی لە سوڵتان محەمەد فاتیحەوە بۆ هاتووە، بڕینی ماوەی نێوان حیجاز بۆ

ئەستەنبۆڵ، سەرەتایساڵی نوێی بەسەر گۆرانی هێناوە کە بریتی بووە لە ساڵی ٨٦٢ك ١٤٥٨ز. ئەوەی زیاتر لەم ساڵە دڵنیامان دەکاتەوە، ئەوەیە کە لەو کاتەدا سوڵتان محەمەد فاتیح سەرقاڵی گرتنی ناوچەی سەمەندیرە بووە، هەر لەو کاتەشدا مەلا گۆرانی لە قودسەوە بەڕێ دەکەوێت، هاوکاتی ئەو ساڵە دەبێت، سوڵتان محەمەد فاتیح کۆتایی بە شەڕەکە دێنێت.

مەلا گۆرانی ڕێگەی چوونەوەی بۆ ئەستەنبۆڵ و ئاشتبوونەوەی لەگەڵ سوڵتان بە گرێیەکی زۆر قوڵ نەدەبینی، چونکە خۆی لە منداڵییەوە پەروەردەی کردبوو، لە کەسایەتی و سروشتی شارەزا بوو، دەیزانی فاتیح سوڵتانێکی دڵ نەرمە و ڕێزی زانایانی زۆر لایە، بەڵام خەمی گەورەی ئەوە بوو، کە چۆن بتوانێ لەگەڵ پیاوانی نێو کۆشك هەڵسوکەوت بکات. نەیدەتوانی وەکو ئەوان بێت. بۆیە هەمیشە ترسی لێیان هەبوو، بەڵام کاتێك گۆرانی دەگەڕێتەوە بۆ ئەستەنبۆل، سەیر دەکات لە کۆشك هەموو شتێك گۆڕاوە، ئەو کەسانەی بوونە هۆی تێکدانی نێوانیان هەموویان لە پۆستەکانیان لابراون، کەش و هەوایەکی سیاسی جیاوازتر بەر لە دەرچوونی دەبینرا، هەرچەندە هۆکاری ئەم گۆڕانکارییەش نەزانراوە، بەڵام گومان لەوەدا نییە دوای جێهێشتنی مەلا گۆرانی لە شاری بۆرسە فاتیح هەستی بە ڕۆڵی سلبی ئەم دەستەیە کردبوو، بۆیە هەموویانی لە پۆستەکانیان لادابوو.

دوای ئەوەی لەگەڵ فاتیح بە یەکتر شادبوونەوە و دەست لە مەلانێ و گەردن ئازدییان بۆ یەکتر خواست، وەکو مامۆستا و قوتابی جاران

کەوتنە گفتوگۆ. فاتیح ویستی نیازپاکی خۆی بۆ مەلا گۆرانی نیشان بدات،بۆیە گەڕاندییەوە سەر هەمان پۆستی خۆی و لەپاڵ ڕێز و خۆشەویستی بۆی، پاداشتێکی زۆریشی کرد.بەم شێوەیە دوای دوو ساڵ لە دوورکەوتنەوەی، گەڕایەوە سەر هەمان پیشەکەی پێشووتری و جارێکیتر لە شاری بۆرسە نیشتەجێ بوو. ئەمە دواین ناخۆشی و تێکگیرانی مەلا گۆرانی دەبێت تا مردنی.[١]

مەلا گۆرانی دووبارە دەستدەکات بە کاری دادوەری لە شاری بۆرسە. ڕۆژانە سەرقاڵی کارەکەی خۆی دەبێت، ئەو ماوەیە هیچ ڕووداوێکی سیاسی ڕووینەدا بوو، بۆیە سەرچاوەکان هیچ ئاماژەیەکی ئەوتۆیان لەبارەی مەلا گۆرانی پێنەداوین، تەنها تاقە بەڵگەنامەیەکمان لە ئەرشیفی عوسمانیی لەم ماوەیەدا بۆ جێماوە، ئاماژە بە کارێکی مەلا گۆرانی دەکات، ئەویش هەر پەیوەندی بە کاروباری قەزاوەت و دادوەرییەوە هەیە، بەڵگەنامەکە باس لەوە دەکات، کە مەلا گۆرانی بە نامەیەکی ڕەسمی ئاگاداری سوڵتان محەمەد فاتیحی لە دیاردەیەکی ناشیرین کردۆتەوە، خەریکە تەشەنە دەکات، ئەویش بریتی بوو لەسەرهەڵدانی هەندێ بازرگانی هیندی کە لەگەڵ عەجەمەکان ڕێککەوتبوون فێڵیان لە خەڵك دەکرد و زیانیان لە دەوڵەت دەدا، هەروەها قاچاخچێتی و قۆڵ بڕییان دەکرد، هەر بۆ ئەم مەبەستە مەلا گۆرانی نامەیەکی ئاگادارکردنەوە بۆ محەمەد فاتیح دەنووسێت، بۆ ئەوەی ڕێگرییان لێبکات.

---

[1] YILDIZ ; S 66



ئەمە لە بواری کاروباری دادوەریدا، بەڵام  لە ڕووی زانستییەوە مەلا گۆرانی ئەم ماوەیەی لە شاری بۆرسە نیشتەجێیە، زۆربەی کاتەکانی سەرقاڵ دەبێت بە تەواوکردنی تەفیسرەکەی ( غایەت و  الامانی)، کە سەرەتای پڕۆژەی ئەم نووسینەی لە قودس دەست پێکردبوو، لە کۆتاییەکانی ساڵی ٨٦٠ ك لە ٣ ڕەجەبی ٨٦٧ ك – ٤٢ مارتی ١٤٦٣ز، ڕۆژی پێنچشەممە تەواوی دەکات و پێشکەشی سوڵتان محەمەد فاتیحی دەکات، [١] بەم شێوەیە مەلا گۆرانی ژیانی بەردەوام دەبێت، تا لە لایەن سوڵتان محەمەد فاتیح بە شەیخول ئیسلام  دادەمەزرێت.

---

[1] YILDIZ ; S 6٧

### ٢. ٢٤ :بوونی مەلا گۆرانی  بە موفتی و شەیخولئیسلام:

دەوڵەتی عوسمانیی جگە لە دەسەڵاتی سوڵتان لەسەر دوو پایەیتری گرنگ وەستا بوو، ئەوانەش شەیخول ئیسلام و سەدری ئەعزەم بوون، یانی بە شێوەیەکیتر بریتی بوو لە پایەی ئایینی و کارگێڕیی، کە پایەی شەیخولئیسلام گوزارشت بوو لە کاروباری ئایینی و فتواکان و دامەزراندنی پیاوانی ئایینی و کاروباری دادوەریی کردن، پایەی سەدری ئەعزەمیش بریتی بوو لە دامەزراندنی والییەکان و سەرپەرشتی کردنی سوپا و ڕاگرتنی ئاسایشی وڵات و دامەزراندنی وەزیرکان و بەڕێوەبردنی کاروباری کۆشك. مەلا گۆرانی بە چوارەم شەیخولئیسلامی دەوڵەتی عوسمانیی دادەنرێت، لە دوای هەریەکە لە مەلا فەناری ( ١٤٢٤–١٤٣٠)، مەلا فەخرەدین عەجەمی ( ١٤٣٠–١٤٦٠) و مەلا خەسرەو ( ١٤٦٠–١٤٨٠).

مەلا گۆرانی بەهۆی خەسڵەتە سەرسوڕهێنەرە کانی و جدییەتی لە کاورباری دادوەریی، و ئەو ئاستە بەرزەی لە بواری زانستە شەرعیەکان هەیبوو، بە تەواوی سەرنجی زانایانی ڕاکێشا بوو، بە تایبەتی دوای ئەوەی چەند بەرهەمێکی نووسینی لە بوارەجیاجیاکانی شەریعەت، پێشکەش بە سوڵتان کرد، محەمەد فاتیح بە خوێندنەوەی پەرتووکەکانی مەلا گۆرانی ئەوەندەی تر هۆگری مامۆستاکەی دەبێت.

ئەمەش وای کرد مەلا گۆرانی ببێتە ڕەمزێك لە پیاوانی نێو سەڵتەنەتی عوسمانی و هیچ کەس نەیدەتوانی ئینکاری ئەوە بکات. ئەم ماوەی لە بۆرسە دەمێنێتەوە، بەبەردەوامی لەگەڵ محەمەد فاتیح چاویان بە یەکتر

دەکەوێت، سوڵتان بە تەواوی ئەوەی لە دڵی یەکلای کردبویەوە، کە گەورەترین پایەی ئاینی بە مەلا گۆرانی ببەخشێت، بۆ ئەمەش لە فرسەتێك دەگەڕا، بۆیە روودانی هەڵسوەکوتێکی فاتیح لەگەڵ شەیخولئیسلام بوە هۆکارێکی خێر بۆ مەلا گۆرانی، ئەمە دوای ئەوەی توانی زیرەکی خۆیشی لەم بابەتە بسەلمێنێت. بەر لەوەی بچینە سەر ڕووداوەکە پێویستە ئاماژەیەکی کورت لەسەر ژیانی مەلا خەسرۆی شەیخولئیسلامی ئەو سەردەم بکەین، مەلا خەسرۆ زانایەکی فەقیهی حەنەفیەو، سێیەم شەیخولئیسلامی دەولەتی عوسمانی بوو، کە ناوی محەمەد کوری فێراموزی بوو، خۆی لە بنەماڵەیەکی کریستان بووە و باوکی ئەفسەرێکی فەرەنسی بووە، بەڵام دواتر دەبێتە موسڵمان، لەساڵی ٨٨٥ ك – ١٤٨٠ز لە ئەستەنبۆل وەفات دەکات، لە شاری بۆرسە دەنێژرێت، مەلا خوسرەو لای زاناکانی سەردەمی خۆی وانەی خوێندووە، ماوەیەك لە شاری ئەدرنە سەرقاڵی وانە وتنەوە بووە، لە سەردەمی موراد خان سەرقاڵی قەزاوەتی عەسکەری بووە، دواتر دەبێتە مامۆستای محەمەد فاتیح و ئەویش زۆری خۆشویستووە،بە ئیمامی حەنەفی ئەو سەردەمی بانیگکردووە، ماوەیەك لە شارەکانی بۆرسە و ئەستەنبۆل خەریکی وانە گوتنەوە دەبێت، لەگەڵ وەفاتکردنی مەلا فەخرەدین، مەلا خەسرۆ بە شەیخولئیسلام دامەزراوە. مەلا خەسرۆ سەرەڕای ئەوەی بەرزتری پلەوپایەی ئاینیی هەبوو، لەگەڵ ئەو ماڵ و موڵك و خزمەتگوزارییەی، بەڵام بە خۆی ژوورەکەی خۆی پاکدەکردەوە و ڕێکی دەخست.



مەلا خەسرەو (خەیاڵی ئەندێشەیی)

سوڵتان محەمەد فاتیح وەکو نەریتی هەمیشەیی، هەموو جارێك مەلا خەسرۆ و مەلا گۆرانی و ئاق شەمسەدینی بۆ کۆبوونەوەکانی بانگ دەکرن، ڕۆژێك بەر لە کۆبوونەوە، وەکو ئەوەی مەبەستێکی هەبووبێت، هەواڵ دەدا مەلا گۆرانی کە بۆ بەیانی کۆبوونەوە هەیە و پێویستە ئامادە بێت، بەڵام فاتیح داوایەکی سەیر لە مەلا گۆرانی دەکات.

ئایا حەزدەکەیت لە کۆبونەوەکە لە کام شوێن دانیشیت؟

مەلا گۆرانی بەو شێوەیە وەڵامی سوڵتانی دایەوە:ئەو شوێنە بۆ ئێمە شیاوە، کە لە سەرووی مەجلیسەوە دانەنیشین، بەڵکوو لە خواروو دانیشین و خزمەت بکەین.

ئەم وەڵامەی مەلا گۆرانی بۆ فاتیح، زۆر سەرسوڕهێنەر بوو، زۆری پێخۆش بوو، لە هەمان کاتیشدا سوڵتانی خستە مەوقیفەوە، کاتێك دانیشتنەکە دەستی پێکرد محەمەد فاتیح بڕیار دەدات، مەلا گۆرانی لەلای دەستە راستی خۆی دادەنێت، مەلا خەسرۆش لەلای دەستە چەپی دابنیٚ، لەکاتێکدا مەلا خەسرۆ پلەی موفتی و شەیخولئیسلامی هەیە، بۆیە هەست بە کەمییەك دەکات بەرامبەر بە مەلا گۆرانی، هەر بۆیە مەلا خەسرۆ وەکو ئەوەی نەهاتبێتە کۆڕەکە، زۆر تووڕە دەبێت و ئەستەنبۆل جیٚ دەهێڵێت و ڕوو لە شاری بۆرسە دەکات، و لە فێرگەکانی ئەویٚ دەرس دەڵێتەوە، بەڵام دوای ماوەیەك سوڵتان فاتیح هەست بە پەشیمانی دەکات و نامەیەك بۆ مەلا خەسرۆ دەنێرێت و ئاشتی دەکاتەوە،دووبارە دەگەڕێتەوە سەر کاری شەیخولئیسلام [1]، ئەم ڕووداوە لەساڵی ٨٦٧ ك –١٤٦٣ ز، ئەمە پوختەی ڕووداوەکەیە، هەرچی سەرچاوە هەیە ئەم تۆرانەی مەلا خسرۆ بە سەرەتای کاری شەیخولئیسلامی، مەلا گۆرانی دەزانن، بەڵام لە هەمان کاتدا دوای ماوەیەکی کەم مەلا خسرۆ دەگەڕێتەوە سەر پیشەکەی خۆی، کەواتە مەلا گۆرانی جارێکیتر لە کاری شەیخول ئیسلام لابراوە؟ بێگومان نەخێر، چونکە سەرچاوەکان وامان پێناڵێن، لە کاتێکدا نابێت لە هەمان سەردەم دوو کەس ڕۆڵی شەیخولئیسلام بگێڕن، ئەی کەواتە بابەتەکە چۆنە، بیٚ گومان باشترین لێکدانەوەی ئەو بابەتە شیکردنەوەکەی ساکیب یڵدزە، کە بڕوای وایە موفتیەتی لەگەڵ شەیخولئیسلام دوو پلەی جیاوازن، شەیخولئیسلام لە

---

, s 410 [1] Franz Babinger

موفتییەتی بەرزترە، بۆ ئەمەش چەندین بەڵگەی ریزکردوون،وەك دەڵێت لە سەردەمی سوڵتان محەمەد فاتیح قانون نامەیەکی دەرکردووە و تیایدا هەردوو دەسەڵاتی شیخولئیسلام و کاری موفتییەتی لەیەکتر جیاکردۆتەوە، بەڵام ئەوە دیاری نەکراوە، کە یەك کەس نوێنەرایەتی کردووە، یاخود دوو کەس، [1] ئێمە لێرە بواری باسکردنمان نییە، کە لە پێشووترە وەکو وا دەبینرێت مەلا خەسرۆ هەردوو پلەکەی بەدەست بووە،ڕەنگە سوڵتان محەمەد فاتیح بە پلانێکی پێش وەختە ئەم سیناریۆیەی رێکخستبێت، بۆیە کاتێك مەلا گۆرانی دەبێتە موفتی، لەو رۆژەوە ڕقێکی زۆری بەرامبەر هەڵدەگرێت، لە چەندین بەرهەمی نووسینی خۆی وەڵامی مەلا گۆرانی داوەتەوە.

لەم ماوەیە تا مردنی مەلا خسرۆ، خەریکی کاری مەفتیایەتی دەبێت، بەڵام لە ساڵی ( ٨٨٥ك) ١٤٨٠ ز مەلا گۆرانی بەرەسمی تا رۆژی وەفاتکردنی ٨٩٣)ك ١٤٨٨ (ز دەبێتە چوارەم شەیخولئیسلامی دەوڵەتی عوسمانی.

کاتێك سوڵتان محەمەد فاتیح مەلا گۆرانی بە پلەی موفتی دەوڵەتی عوسمانیی دادەمەزرێنێت، مووچەیەکی خەیاڵی بۆ دەبڕێتەوە کە بریتی بوو لە هەر رۆژەی (٢٠٠) ئاکچە، مانگانە (٢٠٠٠٠) و ساڵانە زیاتر لە (٥٠٠٠٠) ئاکچە مووچە کەی بوو واتە بە کۆی گشتی داهاتی ساڵانەی مەلا گۆرانی ( (٣٦٢ هەزار ئاکچە بوو، ئەمە جگە لەوەی چەندین دیاریی و خزمەتکاری بۆ ناردوە، ژیانێکی زۆر خۆشگوزەرانی بەسەر بردووە، [2]ئەم

[1] YILDIZ ; S 68

[2]گاشکبوبەری زادە : ص ٥٣

پاداشتەی سوڵتان بۆ گۆرانی، کە لە پێشووتردا بە هیچیەك لە شەیخولئیسلام و پایە ئیداریی و سەربازییەکانی نێو کەسانی دەوڵەت نەدرابوو، محەمەد فاتیح بە تەواوی متمانەی بە کەسایەتی مەلا گۆرانی هەبوو، هەستێکی تایبەتی لە بەرانبەر دەنواند، لە کاری دەوڵەتدارییدا زۆر پشتی پێ بەستووە، بە تایبەتی دوای ئەوی چەندین بەرهەمی پڕ بایەخی پێشکەش بە سوڵتان کرد.

بەڵام نابێت خوێنەر بەلایەوە سەیر بێت، کاتێك بڵێت ئەم مووچە خەیاڵییە بەشی پیاوێکی خواناس و دونیا نەویستی وەکو مەلا گۆرانی نەکردوە، بەڵکوو بە قەرزارییش سەری ناوەتەوە، چونکە ئەوەی لە خەزینەی دەوڵەت بە دەستی دەهێنا، هەر بۆ کاری خزمەتگوزاری خەرجی دەکردەوە، کە توانی بەو موچەیەی چەندین قوتابخانە و مزگەوتی کردۆتەوە. ئەو ماوەی گۆرانی سەرقاڵی کاری موفیتیەکەی دەبێت، زانیاری زۆر کەم بەردەستن، تا ئێستا ئەوەی توانراوە لە فتواکانی بدۆزرێتەوە، دوو دانە فتوایە کە بەدەستی خۆی نوسویەتی، وەکو لە لاپەرەکانی یەکەم پیشانمان داوە.

مەلا گۆرانی وەکو دیارە لە فتواکانی نەریتی وابووە کە سەرەتاکەی بەم شێوەیە دەست پێکردووە (اللهم هادي عليه اعتمادي)، لە دوای ئەوەش نووسیویەتی (ئەم بابەتە وەڵامەکەی بە گوێرەی حەنەفی بەیان کراوە) کە تیایدا هاتووە:





## ٢. ٢٥: قوتابییەکانی مەلا گۆرانی:

مەلا گۆرانی یەکەم ئەزموونی مامۆستایەتی بۆ قاهیرە دەگەڕێتەوە، کە دوای وەرگرتنی ئیجازەی مەلایەتی لە لایەن ئیبن و حەجەرەوە، بە مامۆستا لە قوتابخانەی بێرکۆکییە دادەمەزرێت، لەوێ تا ڕووداوی ئەو بوهاتانەی، بۆی هەڵبەسترا،دوو ساڵ سەرقاڵی وانە وتنەوە دەبێت لە نێوان ٨٤٢ –٨٤٤) ک)، ١٤٣٨–١٤٤٠ ز، ئەو ماوەی گۆرانی دەرسی تیادا وتۆتەوە، سەرەڕای کورتی ماوەکەی و بەهۆی کەم ئەزموونی مەلا گۆرانی لە پیشەی وانەبێژی، ڕەنگە هەر دەرسە سەرەتاییەکانی وتبێتنەوە، هەرچەندە لەو ماوەیەش ناتوانین ئایا ئەو قوتابیانە کێ بوون کە وانەیان لای خوێندووە، بەڵام ڕۆڵی ڕاستەقینەی مامۆستایەتی مەلا گۆرانی لە ئەنادۆڵ دەست پێدەکات، دوای

ناسینی مەلا یێگان و نیشتەجێبوونی لە شاری بۆرسە لە ساڵی ٨٤٥ ك، ئەم ماوەیەی لە دوو قوتابخانەی ئەویَ وەکو مامۆستا ژیان بەسەردەبات، دیسان هیچ شتێك لە بارەی ژیانی مامۆستایەتی و قوتابییەکانی نازانین، بەڵام دووەم قوتابی دیاری مەلا گۆرانی، کە هەموو شتێکی لە بارەیەوە دەزانین، بریتییە لە شازادە محەمەد، ئەم ماوەی کە وەکو مامۆستای تایبەت بۆ محەمەد شازادە دادەمەزرێندرێت لەلایەن موڕدای دووەم. بە گوێرەی خودی نامەی مەلا گۆرانی بێت دەقەکەی لە بەشی داهاتوو دەیخەینە روو بە ژمارەی (٦٠٨٩)، لە دێری دوانزە و سیانزە ئاماژەی بەوە کردووە کە تا ئەو کات چل ساڵی تەمەنی بە وتنەوەی وانە بەسەر بردووە، ئەوەی باسمان کرد، هەڵبەتە بە رەسمی وەکو مامۆستا دامەزراوە، جگە لەوەی لەپاڵ پیشەی ڕەسمی خۆی، کە چ دادوەری سەربازی گشتی بووبێت، یاخود قازییەتی، بەردەوام وانەی تیادا گوتوتەوە، ئەگەر ماوە رەسمییەکەشی وەربگرین ئەوا دەبێت گۆرانی قوتابییەکی بیَ شوماری پیَ گەیاندبیَ، دروستکردنی ئەو هەموو قوتابخانانەش، هەر سەلمێنەری ئەوەیە کە سەرەڕای پیشەی شێخولئیسلامی خەریکی وتنەوەی وانە بووە.

سەرچاوەکان ناوی ژمارەیەکی کەمی قوتابیانیان بۆ ئێمە گواستۆتەوە، یەکێك لەو قوتابیانە بە ناوی عەلائەدین عەلی عەرەبی بوو، کە لە دەوروبەری شاری حەلەب لەدایکبووە، دوای تەواوکردنی بەشێکی خوێندن ڕوو لە ئەنادۆڵ دەکات، لە شاری بۆرسە لە لای مەلا گۆرانی دەستی بە خوێندن کردووە، گۆرانی ئاماژەی بە زیرەکیی و لێهاتوویی ئەم قوتابییە کردەووە لەم بارەیەوە سەرسامیی خۆی نیشان داوە، کە گۆرانی بەو قوتابیەی وتووە:تۆ بۆ من وەکو سەید شەریفی بۆ موبارەك شا. بەم پێیەش بێت

عەلائەدین یەکەم قوتابی  مەلا گۆرانی بووە. دوای دامەزراندنی مەلا گۆرانی بە مامۆستای محەمەد شازادە لە مانیسیە، عەلائەدین دەچێتە لای مەلا خدر کوڕی جەلالەددین و لە ئەدرنە لە دار حەدیس دەخوێنێت، ماوەیەکی زۆر لە لای دەمێنێتەوە و لە بواری سۆفیگەری قووڵ دەبێتەوە، دواتر لە ناوچەکانی ئەنادۆڵ وەکو مامۆستا دەست بە گوتنەوەی وانە دەکات، ناوبانگی زۆری لە زانستەکانی تەفسیر و فقه، حەدیس، بابەتە نەقلییەکان. لەسەردەمی شەیخول ئیسلامی مەلا گۆرنی علائەدین عەلی عەرەبی دەبێتە موفتی ئەستەنبۆل، (٩٠١) ك) ١٤٩٦ ز وەفاتی کردووە.

یەکێکیتر لە قوتابییەکانی مەلا موحەیدین عەجەمیە، زانیاری لە شوێن و کاتی قوتابیەتی لای مەلا گۆرانی نییە، بەڵام  بە گوێرەی سەرچاوەکان بێت، ناوی هیچ مامۆستایەکی تر نەهاتووە، کە وانەی لا خوێندبێت، کەواتە تەنها لای گۆرانیی دەرسی خوێندووە، دوای وەرگرتنی ئیجازە لە فێرگەی جۆراوجۆر وانەی وتۆتەوە، لەوانە فێرگەی سەمانییە. لە کۆتایی ژیانیدا بە دادوەری ئەدرنە دامەزراوە، کاتێك لەو وەزیفەی دا بووە، وەفاتی کردووە.

سەرچاوەکان ئاماژە بە ناوی قوتابێکی تر دەکەن، بەناوی شوکرواللە شیروان، بەهۆی ئەوە پیاوێکی پزیشك بووە، لە کۆشکی محەمەد فاتیح سەرقاڵی کاری پزیشکی بووە، لە ئیشەکەی زۆر لێهاتوو بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە بواری تەفیسر و حەدیس زانیاریەکی فراوانی هەبووە، لە گەڕانەوەی لە حەج دا ماوەیەك لە قاهیرە نیشتەجێ دەبێت، لەلای سەخاوی وانەی خوێندووە، کاتێك دووبارە روو لە ئەستەنبۆڵ دەکات لەوخانەی فەرموودە (دار حەدیس)ەی کە گۆرانی دروستی کردبوو، وانەی

فەرموودە وەر دەگرێت لە لای مەلا گۆرانی و تا وەرگرتنی ئیجازە بەردەوام دەبێت، لە ساڵی ٨٩٠) ك ١٤٨٥ ( وەفاتی کرددوە.

جگە لەوانەش لە هەندێ پەراوێزدا ناوی قوتابی تری مەلا گۆرانیمان بەرچاو دەکەوێت، لە کاتی کۆچکردنی بەرهەمەکانی مەلا گۆرانی لە تەفیسرەکەی کە لەلایەن قوتابیەکی بە ناوی محەمەد کوڕی یەحیا مازەنی، ئەم تەفیسرەی بۆ کۆپی کردووە، مازەنی تەفسیرەکەی، بەم شێوەیە ناساندووە:لە دانراوی شێخم، مەلا گۆرانییە.

هەروەها لە دانراوی (کشف الاسرار) ی مەلا گۆرانی، کە لە لایەن محەمەد کوری عەلی کۆپی کراوە، بە بەکارهێنانی چەند رستەیەك دەردەکەوێت، کە وانەی فەرموودە و خوێندنەوە لای گۆرانی خوێندووە[1].

## ٢. ٢٦:بەرهەمە زانستییەکانی مەلا گۆرانی:

مەلا گۆرانی خاوەنی بەرهەمێکی کەمی نووسین بوو، هۆکاری ئەمەشی بۆ چەند هۆیەکی سەرەکی دەگەڕێتەوە:یەکەم مەلا گۆرانی پێچەوانەی زۆرێك لە زاناکان، لە تەمەنێکی درەنگ دەستی بە نووسینی بەرهەمەکانی کرد بەجۆرێك:

١– یەکەم بەرهەمی بۆ تەمەنی ٤٧ ساڵی دەگەڕێتەوە، ئەمەش بە هۆی ئەوە بوو کە بەتەواوی لە زانستە ئەساسییەکان قووڵ نەبوو بوویەوە، دەستی بە نووسین نەرکرد.

[1] YILDIZ ; S 79-80

٢- مەلا گۆرانی لە تەمەنی ٤٤ ساڵی بە دواوە خەریکی کار و کاروباری میری بوو، زۆربەی کاتەکانی لە کاری دادوەری و موفتییاتی و شەیخولئیسلامی بەسەر دەبات، بۆیە کەمتر دەپرژێتە سەر نووسینەکانی.

٣-خۆ ئەگەر بەرهەمە نووسراوەکانی مەلا گۆرانی بە پێوەری ژمارەی پەرتووکی ستاندەر سەیر بکەین، ئەوە بێگومان ژمارەکە زۆر لەوە زیاتر دەبێت، بۆ نموونە تەنها پەرتووکی (کەوسەر جاری) خۆی لە یانزە بەرگ دەبینێتەوە.

سەبارەت بە بەرهەمەکانی مەلا گۆرانی، تا ئێستا بە تەواوی روون نەبۆتەوە کە خاوەنی چەند بەرهەمە، بۆیە ناچارین سەیری هەموو سەرچاوە عوسمانیی و عەرەبییەکان بکەین تاوەکو بتوانین لە دروستی بەرهەمەکانی گۆرانی نزیك بکەوینەوە، یەکەم سەرچاوە کە پەنای بۆ ببەین و باشترە، بەڵگەنامەی عوسمانیی بێت، لە بەڵگەنامەی ژمارە (٦٠٨٩) دا کە لە ئەرشیفی) تۆپ کاپی) پارێزراوە، ئێمەش پێشووتر ئاماژەمان پێکرد، لە دێڕی ٥ دا، مەلا گۆرانی ئاماژە بە سێ بەرهەمی نووسینی خۆی دەکات:کە بریتین لە تەفیسیرەکەی و شەرحی بوخاری، حەواشی شەرحی جاعبەری.

سەبارەت بە یەکەم بەرهەمی مەلا گۆرانی وەکو لە پێشووتر ئاماژەمان پێکرد، بریتی بوون لە:

- مەلا گۆرانی تا ئێستا سێ بەرهەمی نووسینی جێگیر کراوە (الدرر اللوامع فی شرح جمع الجوامع) لە بواری ئوسوڵی فیقهدا کە لە ساڵی ٨٦١ك –١٤٥٧ز لە قودس نووسیویەتی [١].

هەریەك لە سەخاوی، شەوکانی و سیوتی ناوی ئەم بەرهەمانەی مەلا گۆرانییان بردووە:شرح جمح الجوامع، تەفسیری غایەت الامانی، شەرحی بوخاری و لەگەڵ چەند دێر هۆنراوەی لە ستایشی سوڵتان محەمەد فاتیح.[٢]

- تاشکۆپەری زادە، ئەم بەرهەمانەی ئاماژەپێکردوون (غاية الأماني في تفسير السبع المثاني، الكوثر الجاري في رياض البخاري، حواشي على شرح الجبري للشاطبية)[٣].

حاجی خەلیفە لە هەردوو بەرگی (کەشف زەنون) ئەم بەرهەمانەی مەلا گۆرانی لە شوێنی جیا جیا ئاماژە بۆ کردوون:

- الكوثر الجاري في رياض البخاري، ئەم پەرتووکەی لە ساڵی ٨٧٤ ك تەواو کردووە، شەرحێکی مامناوەندی بۆ سەحیحی ئیمامی بوخاری کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا بەرپەچی زۆرێك لە بۆچوونەکانی کرمانی و ئین وحەجەری داوەتەوە،کە سەرەتای شەرحەکەی بەشێوازێکی پوخت و جوان دەربارەی شێواز و چۆنیەتی هاتنی وەحی بۆ سەر پێغەمبە (د.خ) باسکردووە [٤]

---

[1] كشف ظنون ، ج ١ ، ص ٥٩٦

[2] السخاوي ، ص ٢٤٢ . السيوطي ، ص ٣٩ شوكانى ، ص ٤١

[3] طاشكوبةرى زادة : ص ٥٣

[4] كشف ظنون ، ج ١ ، ص ٥٥٣

- الدرر اللوامع في شرح جمع الجوامع،[1]
- حواشي على شرح الجبري للشاطبية،[2]
- رسالة في الولاء (الرد على ملا خسرو) كه سەرەتای بەرپەرچدانەوەکەی بەم شێوەیە دەستپێکردووە:(الحمدالله الذي من ارادة به خيرا فقهه في الدين)،[3]
- (الشافيه)، ئەم بەرهەمی مەلا گۆرانی پێکهاتووە لە ٦٠٠ دێرە شیعر، کە ناوەرۆکەکەی بریتییە لە ستایشی محەمەد فاتیح و سەرەتاکەی بەم دوو دێڕە دەست پێدەکات:

بحمداله الخلق ذى العلول والبر

بدأت بنظم طيه عبق النشر[4]

- غاية الأماني في تفسير كلام الرباني،[5]
- شرح الكافية لأبن الحاجب في النحو[6]
- (كشف الأسرار عن قراءة الأئمة الأخيار) بریتییە لە شەرحێك لەسەر هۆنراوەی) الجزری)، کە سەرەتاکەی بەم شێوەیە دەستپێکردووە، (بدأ بحمدالله نضمى اولا).[٧]

---

[1] كشف ظنون ، ج ١ ، ص ٥٩٦

[2] كشف ظنون ، ج ١ ، ص ٦٤٦–٦٤٧

[3] كشف ظنون ، ج ١ ، ص ٨٩٩

[4] كشف ظنون ، ج ٢ ، ص ١٠٢٢

[5] كشف ظنون ، ج ٢ ، ص ١١٩٠

[6] كشف ظنون ، ج ٢ ، ص ١٣٧١

[7] [7] كشف ظنون ، ج ٢ ، ص ١٤٨٦

هەرچی پەیوەندی بە سەرچاوە تورکییەکانەوە هەیە، هەریەکە لەئیسماعیل پاشا بەغدادی، ئەحمەد ئاتێش و ساکیب یڵدز، دوای گەڕان و پشکنینێکی زۆر ئەم بەرهەمانەی خوارەوەیان بۆ ساغکردووینەتەوە:

١-غاية الأماني في تفسير السبع المثاني، وهو كتاب في تفسير القرآن الكريم.

- الكوثر الجاري في رياض البخاري، وهو كتاب لطيف أجاد فيه شرح أحاديث البخاري في عدة مجلدات.
- الدرر اللوامع في شرح جمع الجوامع، وهو كتاب للسبكي في الأصول.
- شرح الكافية لأبن الحاجب في النحو.
- -الشافية، في علم العروض والقافية وقد أهدى كتابه الشعري هذا المتضمن ستمائة بيت للسلطان محةمةد الفاتيح.
- حواشي على شرح الجبري للشاطبية.
- فرائد الدرر في شرح لوامع الغرر.
- رسالة في الولاء (الرد على ملا خسرو)
- كشف الأسرار عن قراءة الأئمة الأخيار[1] .

[1] Ahmet Ateş Ö s 250 ; Yıldız s 90-91 هديه العارفين ، ص١٣٥

بسم الله الرحمن الرحيم ۞ رب يسر ولا تعسر ۞

الحمد لله الذي جعل حملة كتابه مع السفرة الكرام
البررة ۞ وأثنى عليهم في محكم كتابه وكرره ۞ والصلاة
والسلام على من جعله في حلية الرسالة محلى وصدره ۞ وعلى آله
وصحبه من هاجر إليه أو آواه ونصره ۞ محمد الذي بشر
بأن خير أمته من تعلم القرآن وعلمه صلى الله عليه ۞
وشرفه وكرمه ۞ وبعد فإن خير كلام كلام الله
وقد أثنى على من تلاه ۞ بقوله إن الذين يتلون كتاب الله
والآيات والأخبار في ذلك متكاثرة ومتواترة ثم
إني مذ كنت يافعا ۞ كنت لآياته تاليا وساميا ۞ كتبت
لألفاظه ومعانيه الحواشي والشروح ۞ وميزت بين
المقبول والمجروح ثم وقفت على نظم للإمام
أستاذ المتأخرين شيخ الإسلام محمد بن محمد الجزري تغمده الله
بغفرانه يشتمل على زيادة ابن محيصن والأعمش والحسن البصري
وهو نظم في غاية الإشكال لم يسبق له مثال ولا نسج
على منوال فاستخرت الله في حل رموزه ۞ والإحاطة بنفائس كنوزه ۞

نشرحته شرحاً وافياً بالغرض مع زوايد • هي زوايد وسميته
كشف الاسرار • عن قراءة الائمة الاخيار • وقبل الشروع
في المقاصد اقدم محاسن الفوايد منها ان هذه
القراءات الثلث ليست من القران الكريم وان كان احتمال
كونها قراناً ارجح اذ من شرط التواتر ومن شرط التواتر ان يكون
ناقلوه في كل عصر عدداً لا يمكن تواطوهم على الكذب
ومن المعلوم ان ليس هذا الشرط موجوداً في هذا العصر وان كان
متواتراً عند اوليك المشايخ ومنها ان عدد السور
علم توقيفي من رسول الله صلى الله عليه وسلم على ما روى
ابي بن كعب ما كنا نعلم اخر السورة الا اذا قال اكتبوا هنا
بسم الله الرحمن الرحيم ولم ياتي في اول براة بشي نعم هذا قول
الكشاف في فواتح البقرة الايات توقيفية كالسورة وفيه
نظر لان التوقيف لهذا المعنى لا يوجد في الايات اذ لو كا
كذلك لم يقع فيها خلاف كاوايل السور ولتيسر كذلك
كما ترى الجعبري وغيره يقولون في اي السور خمس كو
ست شامي سبع بصري ونحو هذا بل التوقيف هنا بناء
على ما اختاره السلف قال الامام الاجل ابو جعفر احمد بن علي
النيسابوري عدد الكوفة منسوب الى حمزة الزيات
وهو اصح الاعداد لانه ماخوذ من علي بن ابي طالب وعدد
اهل المدينة منسوب الى ابي جعفر وعدد اهل البصرة
منسوب الى عاصم الجحدري وعدد اهل الشام منسوب

ولو جئنا بمثله مدادا قال في الكشاف هذه قراءة ابن عباس
وهو بمعنى وهو ما يمد به والله اعلم السورة تمت والصلوة على
من دايرة الرسالة به تمت

## سورة مريم عليها السلام

وها ضم حز دا جزم يرث شف وهيين بكسر وخف
برا افتح معاجلا

ذكر ان سرموز حا حز الحسن قراها في كاف ها بضم الهاء في الكشاف
عنه ضم الياء ايضا ولم يظهر في الوجه الا ان يكون لغة قوم ثم ونقل
عليه في الكشاف انها لغة الحجاز لكن قال ليس صفة الضم والا
لوجب قلب الالف بعدها واوا والمراد التفخيم والامالة نحو
الواو لان هذه الهاء لما لم يكن لها اصل فتارة يميلونها نحو الياء وتارة
الى نحو الواو ثم ذكر ان سرموز شين شف الشنبوذي قراءتي ويرث ث
بالجزم على انه جواب لقوله هب لي والرفع على الوصف ثم
ذكر ان قوله تعالى هو علي هين قراه سرموز حا حلا الحسن بكسر الياء
مخففا ولم ينقله احد من المفسرين والمنقول كسر الياء مشددا ه
والاسكان ثم ذكر ان قوله برا بوالديه اولا وبرا بوالدتي ثانيا
قراءة سرموز حا حلا الحسن بفتح الباء وليس فيه خلاف لما ذكر
الكشاف عن ابن نهيك الكسر بمعنى انه نفسه البر مبالغة

وقل فاجابها حل وسيا اكسر والطوب وكلهم نسيا ومن
تحتها سلا

ذكر قوله تعالى فاجاءها قراه سمونرما حل الحسن بحذف

الهمزة في وزن فاراها والوجه فيه التخفيف لثقل الهمز

في كلمة قال الكشاف معناه الجاها المخاض لانه لما نقل الى

المزيد تغير معناه كما في اتى وهو الجي لما نقل الى المزيد جا

الذي اي اعطا ثم ذكر ان سمونر طاطوى المطوعي عن الاعمش

ز قوله منسيا بكسر الميم والوجه فيه اتباع الميم للسين

وكلهم اي الاعمش وابن محيصن والحسن قراوا نسيا بكسر النون

وهي قراءة القوم غير حمزة وحفص قال الجعبري هما لغتان

ثم ذكر ان سمونر ميم ملا ابن محيصن قرا من تحتها بوجهين

فتح الميم وكسرها على ان من جارة او موصولة

ابن محيصن تساقط كحفص حكوا وقول فارفع مداطب بمن

وحاطبوا الطلا

ذكر ان قوله تعالى تساقط عليك رطبا قراه سمونرما حكوا

الحسن بضم التاء والمد وكسر القاف مثل حفص على انه مضارع

ساقط متعد ورطبا مفعوله وسمونرا بالفتح والتشديد

بجعله مضارع تساقط مثل تباعد قلبت التاء سينا وادغم

السين في السين ومن خفف حذف التاء كما تقدم في

تساءلون ثم ذكر ان قول الحق رفعه سمونر ميم مدى وناطب

ابن محيصن والمطوعي وهي قراءة القوم غير عاصم وابن

عامر والوجه فيه انه بدل من عيسى او خبر اخر ووجه

نصبه انه مصدر اي مصدر اي احق قول الحق او منعو

اسمعيل الكوراني فرغ تحريره افقر عباد الله الى عفوه
وغفرانه احمد الكوراني فاضت سجايل
الرضوان في اواخر ربيع الاول من
سنة تسعين وثمان
مائة حامدا لله ومصليا
على نبيه واله
وصحبه وسلم
امين

عليه

# غاية الأماني في تفسير السبع المثاني

به گرنگترین سەرچاوەی مەلا گۆرانی دەدنرێت کە حەوت ساڵ کاری لەسەر کردووە (٨٦٠–٨٦٧) ك، هەندێ لە نوسخەی تەفسیرەکە:


غاية الأماني في تفسير
الكلام الرباني
تأليف
العلامة أحمد بن اسماعيل
الكوراني







وكان الابتداء به في اواخر سنة ستين وثمانمائة في المسجد الاقصى تجاه
باب الجنة تعالى لا والله خير مأمول ومسؤول قد وقع الفراغ
من تحرير هذا التفسير الشريف بعون الله الملك الرؤوف
سنة ست وستين ومأية والف
من هجرة من له العز والشرف

كتبه عبد من عباد الرحمن محمد بن عثمان غفر لهما

## ٢. ٢٧ :کارەکانی مەلا گۆرانی دروستکردنی مزگەوت قوتابخانە و وەقف

مەلا گۆرانی مووچە زۆرەکەی بە هەلزانی، تا لە ڕێگەی خودا ببیەخشێت، ئەو ڕانەهاتبوو لە کەڵەکەکردنی ماڵ و سامان و گلدانەوەی بۆ نەوەکانی، بۆیە ئەو ڕۆژەی دەمرێت، بە قەرزای سەردەنێتەوە، هەمیشە ڕۆژانی هەژاریی و دەربەدەری نێو مزگەت و حوجرەکانی شام ، قودس و قاهیرەی لە بەرچاو بوو، هیچ کاتێك ناز و نیعمەتی دونیا لە خودای خۆی بێئاگای نەدەکرد، ئەو مووچەیی کە سوڵتان محەمەد فاتیح بۆی تەرخانکرد، هەمووی کۆدەکردەوە و هەر جارەو لە پڕۆژەی مزگەوت یاخود قوتابخانەیەك سەرفی دەکرد، تەنانەت لە ئەگەری لێبڕانی پارە بۆ پڕۆژەکانی داوای کۆمەکی لە دەسەلأتدارەکان دەکرد، دەستی لە هیچ کەس نەدەگێڕایەوە، تا خودی سوڵتانیش، ماوەی موفتییەتی مەلا گۆرانی بە سەردەمی لەدایکبوونی و بەرهەمەکانی دادەنرێت، کە لە بواری زانستی و نووسین توانی چەندین پەرتووکی پڕ بایەخ بنووسێت، لە بواری بونیاتنانش توانی قوتابخانە و مزگەوت و وەقفێکی زۆر لە دوای خۆی بەجێبهێڵێت،

سەبارەت بە وەقفەکانی مەلا گۆرانی، چوار ساڵ پێش وەفاتی خۆی واتە لە ڕەجەبی یەکەمی ٨٨٩ ك — نیسانی ١٤٨٩ ز ماڵ و موڵەکەکانی لە وەقف ڕێکخستووە، شێوەی ڕێکخستنی ئەوکاتەی وەقف و لە ئەرشیفی بەڕێوەبەرایەتی گشتی وەقفەکان، ژمارە ٥٧٠ ئەستەنبۆڵ، کە لە دەفتەری وەقفی یەکەم، لە لاپەڕە ٢٢٠ەمین لاپەڕە و ١٣٠ سرەدا لەگەڵ نوسخە عەرەبییەکەی وەك خۆی ماوە، لە تۆماری بەڕێوەبەرایەتی گشتی وەقف لە دەفتەری ژمارە ١٣٨ لە لاپەڕە ٢٥ تا ٣٣ لە بەشی چونە ژوورەوە لەگەڵ ڕستەی دوعا، کە لە ناوەرۆکەکەیدا ئایەت و فەرمودە

دەبینرێت، لەم وەقفەدا ٣٩ پارچەی لەقف لەگەڵ شیکردنەوەی تەواوی مەسروفەکان و بەرهەمەکان، مەرجەکانی و خزمەتکردنی تێچووی رۆژانە و مانگانە و ساڵانە، لەگەڵ چۆنیەتی بەکارهێنانی وەقفەکان تیادا تۆمارکراوە.

مەلا گۆرانی ئەو ماڵ و موڵکەی کە وەقفی کردبوو، ئەرکی چاودێری کردنی کاروباری بۆ کوڕەکەی ئیبراهیم چەلەبی و ئەو نەوانەی لە دوای دێت بۆیانی بەجێهێشت، بەڵام بەو مەرجەی سوڵتان بە گونجاوی بزانێ و کوڕەکی خواناس بێ و تەقوای هەبێت. ئەرکی چاودێریشی بە سەدری ئەعزەم داود پاشا سپارد. [1]

جگە لەمانە مەلا گۆرانی لە ناوچەی گەلاّتە وەقفی هەبووە، لە ناو وەقفەکانی محەمەد فاتیح جێگەی کردبوویەوە. کە بەم شێوەیە بوو، لە ئەوقافی پیرۆز لە گەڕەکی جامی، ٢ کۆگا ٢ ماڵ کە هەردووکیان بەیەکتر بەسترابوون، لەسەر کۆگان ٢ ژوور هەبوو، لە هەمان گەڕەك ٣ حوجرەی هەبوو، لە مزگەوتەکەی مەلا گۆرانی هاوسنوور بوو،

سەبارەت بە قوتابخانە و ئەو مزگەوتانەی مەلا گۆرانی بونیاتی ناون، بەم شێوەیە بوو، لە ناوچەی (گەلاّتە) قوتابخانەیەك و لە ئەستەنبۆڵیش ٣ قوتابخانەی دروستکردن و داهاتەکە ڕۆڵی خوێندن و فێرکردنی تیادا دەبینرا، توانی بە یارمەتی سوڵتان و کوڕەکەی بونیاتنانی ئەم قوتابخانانە تەواو بکات، مەلا گۆرانی لە نامەیەکی دا کە بۆ سوڵتان محەمەد فاتیحی ناردووە ئاماژە بەوە دەکات کە دەڵێت سوڵتانم لە سایەی

---

[1] YILDIZ ; S 87-88 :
http://mufidyuksel.com/fatihin-hocasi-seyhulislam-molla-gurani.html

جەنابتان دوای ئەوەی داوەر (الحديث و دار الكورة (مان دامەزراند، داوای یارمەتیت لێدەکەم بۆ دروستکردنی (خانەی فێربوون) :کە لە بەشێکی نامەکەدا هاتووە لە سایەی خێرەکانی ئێوە سێ (خانەی فێربوون) هەیە، یەکێکیان لە گەلاّتەدا، دووانەکەیتریش لە ئەستەنبۆڵن، هەروەها کلیسایەك کە وێران بوو لە ناوچەی وەفا،ئەگەر رێمان پێ بدەیت ئەوە دەیکەینە (خانەی فێربوون)، توانی قەناعەت بە سوڵتان محەمەد فاتیح بهێنیت و دوایی کردی بە قوتابخانە.



**نامەی مەلا گورانی بۆ (سوڵتان محەمەد فاتیح) لە دێڕی١٤ بە دواوە ـ یلدز٩٦**

هەروەها لە گەڕەکی (تاش قەساب)،کە دەکاتە ناوچەی ئەکسەرای ئەمڕۆ، مزگەوتێکی لەوێ دورستکردووە، کە لە ساڵی ٨٧٦ ک –١٤٧١ ز بونیاتی ناوە، بەڵام دواتر ئەم مزگەوتە دەکەوێتە بەر پڕۆژەی جادەی سەرەکی، کە ئەمڕۆ هیچ شوێنەوارێکی نەماوە، تێچووی ئەم مزگەوتەی هەموو لە خەرجی خۆی دابینکردبوو. مەلا گۆرانی هونەرێکی زۆر سەرسوڕهێنەری هەبوو لە شێوازی داواکردنی یارمەتی لە سوڵتان، یاخود هەرکەسێکیتر، بۆ نموونە لە سەردەمی بایەزیدی کوڕی محەمەد فاتیح نامەیەکی بۆ دەنێرێت، تیایدا داوای یارمەتی لە سوڵتان دەکات ، ئاماژە بەوە دەکات کە خێرو بەخششەکانی ئێوەم تەنها لە دروستکردنی مزگەوت و فێرگەکان سەرف کردووە، ئەگەر هەر کاتێك خێر و بەخششی ئێوەم بە دەست بگات، لەو کارە سەرفی دەکەم و لەسەر دەرگاکانی ناوی ئێوە دەنووسم، بۆ ئەوەی هەر کەسێك بیبینێت، نزا بۆ قیامەتی ئێوە بکات:



نامەی مەلا گۆرانی بۆ سوڵتان بایەزید، تیایدا داوای هاوکاری کردوە (دێڕی ١١ بەدواوە یلدز١٠٢)

دووەم مزگەوت، کە مەلا گۆرانی لە ناوچەی وەفا بونیاتی ناوە، کە توانی کلیسەیەکی چۆڵی سەردەمی بێزەنتییەکان بگۆڕێت بۆ مزگەوت، لەو بارەیەوە زانیاری فراوان هەیە، ئەم مزگەوتەی مەلا گۆرانی بە مزگەوتی کلێسە ناسرا بوو،کە ئەمڕۆ بە گەڕەکی مەلا گۆرانی ناسراوە، لە سەرەتا دا ئەم کلێسەیە ناوی ئەزیز سیۆدۆرس بووە، دروستکردنی بیناکە بە گوێرەی پارچە و خشتەکانی کە تا ئەمڕۆش شوێنەواری لە ناو مزگەتەکە ماون، بۆ ناوەڕاستەکانی سەدەی پێنجەمی زایینی دەگەڕێتەوە، دوای فەتحکردنی ئەستەنبۆڵ، لەلایەن مەلا گۆرانییەوە دەکرێتە مزگەوت، کە تا ئەمڕۆش بە ناوی مزگەوتی مەلا گۆرانی یاخود مزگەوتی کلێسای وەفا دەناسرێت، ئەم مزگەوتە سەرەتاکەی بە چوار ستوون وەستێنرا بوو، ناوەڕاستەکەی قوبەیەکی لێوە بەرز کرا بووەوە، لە خریلەی قوبەکەدا ١٢ پەنجەرەی هەبووە، ڕوخساری دەرەوی کلێسەکە بە خشت و بەرد بونیاتنراوە، سەرەڕای هەیوانەکەی خۆی، یەکێکیتری بۆ زیادکراوە، لەناو هۆڵەکەش میحرابی دروستکراوە، لەلای ڕاستی دیوارەکە ئەستوورەکەی کلێسەکە منارەیەك بە خشت زیادکراوە.[1]

لەپاڵ ئەم مزگەوتەش مەلا گۆرانی قوتابخانەیەکی کردۆتەوە، بەڵام لە ئێستادا هیچ شوێنەوارێکی نەماوە، کە سەرەتا خۆی وەکو مامۆستا وانەی تیادا وتۆتەوە.

---

[1] Vefa Kilise Camii (Molla Gürani Camii) Sürdürülebilir Turizm için Alternatif Tur Rotaları S 9-10،



تابلۆی مزگەتی مەلا گۆرانی (کلێسەی مزگەوتی وەفا ) لە لایەن ١٨٧٧،
A.G. Paspates'in








بینای مزگەوتەکە لە سەردەمی ئەمڕۆدا

وە لە ناوچەی گەلاتەش مەلا گۆرانی کلێسەیەکی تری ناونا (فێرگە) هەر چەندە لەو بارەیەوە هیچ زانیاریی ئەوتۆ بەر دەست نین، لە کاتی ئێستاش هیچ شوێنەوارێکی دیار نییە. یەکێکی تر لە کارەکانی مەلا گۆرانی، دروستکردنی مزگەوتی (ڕەزا پاشا)یە یۆکوشو، ئەم مزگەوتە یەك قوبەی هەیە، کە کەمەری قوبە بە شێوەکی زبر و چوارگۆشەیە، لە سەرەوەی چوار پەنجەرە و لە خوارەوەشی دە پەنجەرەی هەیە کە لە ناوەوەی مزگەوتەکەی رووناك دەکردەوە، لە سەرەتادا منارەیەکی بڵندی لای مزگەوتەکە قوت بۆتەوە ، بەڵام دواتر ڕوخاوە، بینای مزگەوتەکە بە دوو قاتی خشت و یەك قاتی بەردی بڕاو دروستکراوە، پێدەچێ مزگەوتەکە بەو جۆرە گەورە نەبووبێت، ئەمەش بۆ کەم دەرامەتی مەلا گۆرانی دەگەڕایەوە.

## ٢. ٢٨:وەفاتکردنی مەلا گۆرانی، وەسیەت و گۆڕەکەی:

مەلا گۆرانی تەمەنی لە ٨٠ ساڵی نزیك بویەوە، بە تەواوی لەم دونیایە هەستی بە شەکەتی و ماندوویی دەکرد، دەیزانی کاتی ئەو مردنەی هاتووە، دەگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگاری، بۆیە زیاتر دەستی بە خواپەرستی کرد، پێش مردنی، خۆی لە حەق و ماڵی دونیا ڕزگار کرد، دوای مردنی محەمەد فاتیح ساڵی١٤٨١ ز، بەتەوای هەستی بە بێتاقەتی دەکرد، لەگەڵ هاتنی ساڵی ١٤٨٨ ز ٨٩٣) ك (جەستەی بە تەواوی بێهێز ببوو، بێزاریی و جەنجاڵی شاری ئەستەنبۆڵ وای لە مەلا گۆرانی کرد،کە ڕوو لە دەرەوەی شار بکات، بۆ ئەم مەبەستەش کێڵگەیەکی لە دەووربەری شار کڕی، لەوێ نیشتەجێ دەبێت، لە یەکەم ڕۆژانی پاییز لەوێ مایەوە، ئەم ماوەشی بە

گۆشەگیری و چارەسەر وەرگرتن بردە سەر،بەڵام  بە پەرۆشی خەڵکەکە و بەتاییەت وەزیرەکان، هەموو هەفتەیەك دەچوون بۆ سەردانی کردنی لەو کێڵگەیە، دوای ئەوە گەڕایەوە ماڵەکەی لە ئەستەنبۆڵ، بە تێپەڕ بوونی رۆژەکان مەلا گۆرانی باری تەندورستی بەرەو خراپی دەچوو، لە کۆتایی شەوال بە تەواوی باری تەندورستی تێکدەچێت، لە ڕۆژێك دوای ئەنجامدانی نوێژی بەیانی، داوای کرد جێگایەکی بۆ ئامادە بکەن، دوای ئەنجامدانی نوێژی چێشتەنگاو، لەسەر لای ڕاست پاڵ دەکەوێت، داوای لەو قوتابیانەی کە خۆی فێری قورئان خوێندنی کردبوون، ئامادەبن و ڕووی کردە قوتابیەکانی   پێی   گوتن " ئەمڕۆ ڕۆژی دانەوەی حەقمە، ڕۆژی لێپرسینەوەمە، مەبەستی ئەوە بوو، کە ئەمڕۆ ماڵئاواییان لێدەکات، بۆیە داوای لێکردن تا نوێژی عەسر بە بەردەوام قورئانی لەسەر بخوێنن، چونکە دەیزانی تەمەنی لەو ماوەیە زیاتر ناخایانێت، قوتابیەکانیشی بە کۆمەڵ دەستیانکرد بە خوێندنی قورئان لەسەری، لەو کاتە هەواڵی  خراپی بارودۆخی گۆرانی بە شاردا بڵاو بوویەوە، وەزیرەکان بە دەستە سەردانی مەلا گۆرانیان کرد، کاتێك وەزیرکان ئەم دیمەنەی مەلا گۆرانیان بینی، زۆر پێ کاریگەر بوون، لە نێوانیان) داود پاشا)  کە مەلا گۆرانی زۆر خۆش دەوەیست، نەیتوانی دان بە خۆی دابگری و بە کۆڵ دەستی بە گریان کرد.

مەلا گۆرانی پێی گوت:بۆچی دەگریت داود پاشا ؟

ئەویش وەڵامی دایەوە، کاتێك ئێوە بەو لاوازییە دەبینم، ناتوانم دان بە خۆمدا بگرم و نەگریم.

مەلا گۆرانیشی پێی وت:ئەی داود بۆ حاڵی خۆت بگری، من لەو دونیایە لەناو ئاسوودەیی و ئارامیدا ژیام، ئومێدم بە خوای گەورە ئەوەیە، کە کۆتایی تەمەن و کۆتا هەناسەم سەلامەتم بکات.

دواتر مەلا گۆرانی ڕووی کردە وەزیرەکان و پێی گوتن:سەلامم بگەینن بە سوڵتان بایەزید،پێی بڵێن کاتێ کە مردم، خۆی نوێژ لەسەر جەنازەکەم بکات، پێش ئەوەی سپاردەی خاکم بکەن، قەرزەکانم بۆ بداتەوە، سەرچاوە عوسمانییەکان ئەم داوایان لە وەسیەتەکە زیاد کردووە، بۆ ئێوەش وەسیەت بێ:کاتێك کە مردم، تەرمەکەم لەسەر لێواری قەبرەکە دابنێن و لاقەکانم توند بگرن، پاشان بەسەر قەبرەکەم ڕامکێشن و بمخەنە ناوییەوە، دواتر پرسیاری دەکرد، کەی بانگی عەسر دەدات ؟ کە بانگ دەستی پێکرد بە) الله اکبر)، مەلا گۆرانی بەدەم وتی (اشهد ان لا اله الا الله اشهد ان محمد رسول الله)، چاوەکانی لێکنا و لە وڵاتی غەریبی و دوور لە کەسوکاری وەفاتی کرد[1].

کاتێك بایەزید هەواڵی مردنی مەلا گۆرانی بیست، بەپەلە هات و دوای بیستنی وەسیەتەکەی مەلا گۆرانی، فەرمانی کرد بە دانەوەی قەرزەکەی، کە بریتی بوو لە (١٨٠) هەزار ئاکچە، بە بێ ئەوەی سەیری سەنەدی قەرزەکە بکات، دواتر نوێژی لەسەر تەرمی مەلا گۆرانی کرد.

زۆرێك لە خەڵکی ئەستەنبۆڵ نوێژیان لەسەر مەلا گۆرانی کرد. لە ناوچەی فندك زادە لە لای ئەو مزگەوتەی، کە خۆی دروستی کردبوو، هەر لەوێ نێژرا، لەو ڕۆژەدا هەموو شار نوقمی فرمێسك بوو، دەنگی گریان و

---

[1] گاشکۆبەری زادە ، ص ٥٤-٥٥

خواحافیزی تەواوی شاری داپۆشی بوو، ئافرەت و منداڵان بە دەنگی بەرز دەگریان و لاوانەوەیان دەکرد، هیچ گومان نییە لە ڕشتنی فرمێسك بۆ زانایەکی وەها گەورە، کە کاریگەری شەخسیەتێکی بەرزی هەبوو. [١]

سەخاوی دەڵێت:لە کۆتایی رەجەبی ٨٩٣ ك وەفاتی کردووە [2].

تا ئەمڕۆش مەلا گۆرانی خاوەنی گۆڕێکی سادەیە، ئەگەر ناوی کەسێکی ناشارەزا بچێت سەردانی گۆڕەکی بکات، ئەستەمە مەزارەکەی بدۆزیتەوە، ئەمەش بۆ سادەی و تەوازعی ئەم زانایە دەگەڕێتەوە، ئەمەی لەسەر کێلی گۆڕەکەی مەلا گۆرانی نوسراوە:

لااله الاالله محمد رسول الله

قد انتقل من دارالفناء الى دار

البقاء المرحوم المغفور المحتاج

الى رحمة ربه الغفور له العلامة

شيخ الاسلام أحمد

الكؤراني قُدّس سرّه

الاعلى مع الصلوة[٣]

سنة ٨٩٣ ب

---

[1] Franz Babinger, s 406

[2] السخاوی ، ص ٢٤٣

[3] http://mufidyuksel.com/fatihin-hocasi-seyhulislam-molla-gurani.html



**گۆڕی مەلا گۆرانی لە قەراغ شەقامی (فندق زادە)**



شەقامی میللەت لە ناوچەی فندك زادە، ساڵی ١٧٨٦ ز ناوچەیەکی ویران بوو، تاقە کێلی گۆڕی مەلا گۆرانی و دیواری مزگەوتەکە به دیار دەکەوێت. Encümen Arşivi. No:1037

## ٣. ١:خەسڵەتەکانی مەلا گۆرانی

مەلا گۆرانی لەنێو کێوە سەختەکانی شارەزوور و هۆرەی هەورەمان لە ساڵی ٨١٣) ك) ١٤١٠ ز، هاتۆتە دونیا ،لە خێزانیکی هەژاری کورد، گۆرانی خۆی گەورەترین هاوڕێی خۆی بوو، سەختی ژیان، کەسایەتی بۆ دروستکرد، خاوەنی نەفسییەتێکی بەرز بوو، حەقبێژییەکەی ببووە بەڵای ژیانی و دووجار لەوپەڕی شکۆمەندییەوە، گەڕایەوە خاڵی سفر، سووربوونی لەسەر ئەوەی، کە باوەڕی پێیەتی، سوڵتانەکانی ناچار کرد ڕابێن لەسەر بیستنی حەق ، گۆرانی لەبارەی شێوە و هەیکەلییەوە، کە تابلۆیەکی وێنەی خۆی لەگەڵ محەمەد فاتیح کێشراوە ، ئەم تابلۆیە لە پەرتوکخانەی خەزینە بە تۆماری ژمارە ١٢٦٣، لە شەقائیق و نەعمانی تەرجەمە کراوە، کە لە لایەن وێنەکێش محەمەد ناقشی ئەم وێنەیە کێشراوە،هەمان تابلۆ بە شێوەیەکی ڕەنگاو ڕەنگ لەلایەن سوهیل ئونڤێر بە شێوەی وێنە گەورە کراوە ، کاتێك سەرنجی تابلۆکە دەدەیت زۆر مانا لە خۆ دەگرێت، محەمەد فاتیح دەست لە سەر دەست لەبەردەم مامۆستاکەی مەلا گۆرانی ڕاوەستاوە و خەریکە گوێی لێ دەگرێت، دەست وەشاندنی گۆرانی ئاماژەیە بۆ قسەکردنی و مەندیلێکی سپی و گەورە، کەوا سەڵتەیەکی ڕەش، زەرد و سەوزێکی تۆخ. پێدەچی کێشانی وێنەکە بۆ دوای فەتحکردنی ئەستەنبۆڵ بێت، چونکە تەمەنی گەورەی محەمەد فاتیح و تاڵە ریشە سپیەکانی مەلا گۆرانی شاهید



**تابلۆ چاککراوەکەی مەلا گۆرانی و محەمەد فاتیح**

## ٣ . ٢:لە بارەی سیما و خێزاندارییەوە:

خـاوەنی باڵایـەکی بـەرز و جەسـتەیەکی پتـەو بەهەیبـەت بـوو و سیمایەکی پڕی هەبوو، واتە خاوەنی هێز چاڵ و چۆڵییەك لە سیمای بەدی نەدەکرا، ڕیشێکی درێژ و پڕی هەبوو، دەنگێکی ساف لـە خەسڵەتەکانی بوو، کاتێك قـسەی بـۆ هـەر کەسێك دەکـرد، بـە دەنگێکـی گـڕ و سـاف ، وشەکانی لە دوای یەکتر زۆر بەڕەوانی دەردەبڕی، هەر بۆیە قسەی بۆ هەر کەسێك کردبێت، ئەستەم بووە، بتواتنێت سەرسامیی خۆی لەم بارەیەوە بشارێتەوە، هەموو کەس لە قـسەکانی دەگەیـشتن، خـاوەنی دەربڕینێکـی سادە بوو لە پێشووتر باسمان کرد هەر لە یەکەم دیداری (ئیبن حەجەر)، سـوڵتانی مـەمالیك یـەنال ، مـەلا یێگـان و مـوڕادی دووەم، مـەلا گـۆرانی لـەڕووی فیزیکـەوە پیـاوێکی تەندروست بـووە، تـا مـردن لـە نەخۆشـییە درێژخایەنــەکان بــە دوور بــووە، پیریــیش نــەیتوانی جەســتە درێــژ و بەرزەکەی بچەمێنێتەوە، خاوەنی زیرەکی و زەکاوەتێکی سەرسوڕهێنەر بووە، بەسە شاهیدی زاناکانی وەکو ئیبن حەجەر و مەقریزی و سیوتی و شەوکانی، لە کاتێکدا کە تەمەنی نەببووە سی ساڵ و تـا ئەوکاتـەش هـیچ بەرهەمێکی نەنووسیی بوو،بەڵام ناوی لـە ریـزی زاناکـان دانـرا بـوو، تـا مردن زاکیرەی لە دەست نەداوە ،پیاوێکی بە بەرنامە بوو لە ژیان و هەموو کارێکی لە کات و شوێنی خۆی دەکرد، دەیزانی کەی پێویستە قسە بکـات و کەییش بێدەنگ بێت، تا مردنی، هیچ هەڵەیەکی وا گـەورەی نـەکرد، کـە ببێتە مایەی لە کەدارکردنی.

سەبارەت بە ژیانی خێزانیی، جگە لە ماوەیەکی دیاریکراوە، زانیاریمان لەبارەی مەلا گۆرانی نییە، تەنها ئەوەندە نەبێت کاتێك لە قاهیرە لە قوتابخانەی بێرکۆکیە کە مامۆستایەتی دەکرد لە نێوان سالأنی ٨٤٢-٨٤٤ ك،١٤٣٨-١٤٤٠ ز دەبێت، کە ئەو کات تەمەنی لە نێوان ٣٠ تا ٣٢ ساڵیدا بووە، دوای ئەوەی کە رزگاری دەبێت لەو هەژارییەی کە لە منداڵییەوە کێشابووی، باری ماددی بەرەو باشی دەڕوات و بە هۆی یارمەتییەکانی کەماله دین دەربازی بوو، مەلا گۆرانی تا ڕادەیەکی باش بارە مادییەکەی بەرەو باشی دەڕوات و هیچیتر پێویستی بە یارمەتی ئەم و ئەو نابێت، سەخاوی دەڵێ لەو کاتەدا زۆر حەزی چۆتە ئافرەت، چەند جارێك زەواجی لەگەڵیان کردووە، دواتر تەلاقی داون،[1] ئەم نووسینەی سەخاوی بێ ویژدانییەکی زۆری تێدایە، وەك گوتمان سەخاوی زۆر خۆش نود نەبووە بە مەلا گۆرانی ، بۆیە لە تەواوی کتێبەکەی گومان دەخاتە سەر هەموو هەڵسوکەوتێکی مەلا گۆرانی، ئەی کەواتە ئەم بۆچوونە لە کوێوە سەرچاوەی گرتووە؟ بێگومان ئەو کاتەی مەلا گۆرانی لە قاهیرە دەبێت و بە ماوەیەکی کەم دەبێتە خاوەنی پلەوپایە و ماڵ و موڵکێکی زۆر، هەر بۆیە ئەوانەی دەوروبەری چاویان بەو سەرکەوتنانەی مەلا گۆرانی هەڵنایەت و دەکەونە هەڵبەستنی تۆمەتی جۆر بە جۆر یەکێکیش لەو تۆمەتانە ئەوە بوو کە گوایە گۆرانی پیاوێکی زۆر جنسی بووە و

[1] ص ٢٤١-٢٤٢

حەزی بە هێنانی ئافرەت کردووە! هەرچەندە سەرچاوەکان هیچ ئاماژە بە نەوەی مەلا گۆرانی لە قاهیرە ناکەن، لەوە ناچێت خاوەنی هیچ ژن و منداڵێك بووبێت، لەو کاتەی لە قاهیرە دەرچووە.

کاتێك مەلا گۆرانی لە ئەنادۆڵ نیشتەجێ دەبێت، هەرچەندە هیچ زانیاریمان دەربارەی ژن هێنانی گۆرانی نییە، بەڵام ب دڵنیاییەوە ژیانێکی سەڵتی نەبردۆتە سەر، چونکە بە گوێرەی قەیدی وەقفەکانی خۆی، بە ناوی کوڕەکی ئیبراهیم چەلەبی لە ساڵی ٩٢٥ ك ١٥١٩ ز تۆمار کردووە، بە ناونیشانی قازیی پێشووی گەڕەکیماڵکەرە، لە پەرتوکەکەی مەلا گۆرانی (الکوثر الجاری لە بارەی شەرحی بوخاری)، کە نوسخەیەکی ئەم پەرتووکە لە کتێبخانەی مەلا موراد بە ژمارەی٥١٤، کە لە ساڵی (٩٤٤ك) ١٥٣٧ ز، پیاوێك بە ناوی) ئەبو البکا (کۆپی کردووە تیادا ئەوەی تۆمار کردووە، کوڕەکەی مەلا گۆرانی بەناوی (زەینەدین عومەر)، ئەم نوسخەی وەرگرتووە، وەکو دیارە ئەم کوڕەی لە شام نیشتەجێ بووە و هاتۆتە ئەستەنبۆڵ بۆ وەرگرتنی نوسخەی ئەم کتابەی باوکی[1]، واتە لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت، کە مەلا گۆرانی خاوەنی دوور بووە، بەڵام لە بارەی خێزانەکانی و منداڵەکانی تری، هیچ زانیارییەك بەردەست نین.

---

[1] Yıldlz : s 82

## ٣.٣ :خوا پەرستی

مەلا گۆرانی تەوای ژیانی لەناو حوجرە و قوتابخانـە ئایینییـەکان بەسـەر بردووە، هەموو نوێژەکانی یان بە ئیمامی یاخود مەئمونی ئەنجامیـدا، هـیچ پەرتووکێکی زانیاری پێش خۆی نـەبوو، کـە نەیخوێندبێتـەوە، پیـاوێکی زۆر خواپەرست بوو، هەمیشە بنەماکانی ئایینی لەبەر چاو بـوو، هـەموو کـارێکی بە پێوانەی قورئان و سوننەت دەپێوا، هەر شتێك پێچەوانەی شەرع ببووایـە ڕەتی دەکردەوە، زۆر لە خزمەتی قورئاندا بوو، یەکەم زانای کورد بووە، کە توانیبێتی تەواوی قورئانی پیرۆز تەفیسر بکات، تا ئەو رۆژەی وەفاتی کـرد، ئەڵقەی قورئان خوێندن لە ژوور سەری بەردەوام بوو ، ئەمە جگە لە شەرحی فەرموودەکانی بوخاری، مەلا گۆرانی لـە عیبـادەتکردن زۆر جـددی بـوو، بـە جۆرێـك خواپەرسـتی دەکـرد، کـە کـەم کـەس هـەبوو لـەو سـەردەمە بـەو جۆرەبێت، یەکێك لە ڕووداوەکانی کە قوتابییەکی مەلا گۆرانی دەیگێڕێتەوە، شەوێکیان لەلای گۆرانی مامەوە، نوێژی عیشامان بە کۆمەڵ ئەنجامدا و دوای نوێژ مەلا گۆرانی دەستی کرد بە خوێنـدنی قورئـان ی پـیرۆز، لـە سـەرەتای سوڕەتی بەقەرە، بەڵام من نووستم، دواتر هەڵسامەوە سـەیریم کـرد، هـەر بەردەوامە لە خوێندنی، جارێکی تر نووسـتمەوە، دووبـارە هەڵسامەوە ، لـە بەرە بەیان بینیم کە مەلا گۆرانی هـەر بەردەوامـە لـە خوینـدنی قورئـان، لـە کۆتاییەکانی ختم کردنی بوو، کـە سـوڕەتی مـوللکی دەخوێنـد. زۆر سـەیرم پێهات بەو کارەی، کاتێك پرسیارم لە خزمەتکارەکانی کـرد، لـە بـارەی ئـەم کـارەی مـەلا گـۆرانی، وەڵامیـان دامـەوە، کـە ئەمـە تایبەتمەندییـەکی بەردەوامیەتی[1] .

---

[1]گاشکۆبەری زادە : ص ٥٣

## ٤.٣ دونیا  نەویستی:

مەلا گۆرانی هـیچ کاتێـك دڵـی بـە دونیـاوە بەنـد نـەبوو، بـە بـاوەڕەوە دەڕژیا، ناتوانیٚ هیچ غروییەك لە نێـوان سـەردەمی نـەداریی و دەوڵەمەنـدی بدۆزێتەوە، ئەوەی وەری دەگـرت هـەر لـە پێنـاوی خـوا دەیبەخـشییەوە، حەزی بە پۆسـت و پایـە و مەنـسەب نـەدەکرد، بـەڵکوو زۆربـەی کـات لـە دەستکەوت رایدەکرد، وەك ئەوەی سەرەتای هاتنە سەر تـەختی محەمـەد فاتیح، پیشنیازی وەزیری بۆ مەلا گۆرانی دەکرد، بەڵام ئەم بە شێوەکی زیرەکانە و بەبیٚ ئەوەی سوڵتان دڵی لێبڕەنجێت، خۆی لـەژێر بـاری ئـەم بەرپرسـیارێتییە لاداوە. گـۆرانی سـەرباری مووچـە زۆر و زەبەندەکـەی، بەڵام کاتێك وەفات، دەکات بە قەرزاری سەر دەنێتەوە. هەرچی لـە مـاڵی دونیا، کردی بە بینای قوتابخانە و مزگەوت و بۆ ئاسمـانی بـەرز کـردەوە، هەرچیـشی هـەبوو لـە زانـست و زانیـاری خـستییە سـەر پـەڕەی کتێبەکانییەوە، بۆ نەوەکانی دوای خۆی بـە میراتـی نـەبڕاوە جێیهێـشت، حەزی نەدەکرد ئەو ببێتە هۆکاری شەڕ و ئاشوب لە نێـوان موسـوڵمانان، بۆیە کاتێك محەمـەد فـاتیح نامـە بـۆ مـەلیك قـەیتای دەنێرێـت لـە بـارەی ناردنەوەی مـەلا گـۆرانی بـۆ ئـەنادۆڵ، هـەر مـەلیك لەمـە نـاڕازی دەبێـت، گۆرانییش حـەز بـە گەڕانـەوەی لـەو کاتـە نـەدەکرد، بـە هـۆی تـۆرانی لـە محەمەد فاتیح، بەڵام دەیزانی ئەگەر نەگەڕێتەوە ئـەوە کێـشە دەکەوێتـە نێوان دەوڵەتی مەلیك و عوسمانییەکان، تا ئەندازەی خوێنڕشـتن، قـەیتای دەڵیٚ مەڕۆ لای فاتیح، من زیـاتر رێـزت دەگـرم، مەبەسـتی لـە پلەوپایـە و

ماڵی دونیا بوو، بەڵام گۆرانی سوپاسی دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا بە سوڵتان دەڵێت:لە نێوان من و فاتیح خۆشەویستییەکی گەورە هەیە، وەك ئەوەی لە نێوان کورِ و باوکدا هەیە، ئەوەشی لە نێوانمان روویداوە شتێکیترە، ئەو لێم تێدەگات و دەزانێ بەردەوام دڵم لایەتی، جا ئەگەر نەچم، دەزانێ بەهۆی تۆوەیە، بەمەش دوژمنایەتی دەکەوێتە نێوانتانەوە[1].

## ٣. ٥:نەبوونی دەمارگیریی:

یەکێکیتر لە خەسڵەتەکانی مەلا گۆرانی ئەوە بوو، کە پیاوێکی دەمارگیر نەبوو، بە سروشتی خۆی لەنێو ژینگەیەك پێگەیشت، هەڵسوکەوتی لەگەڵ هەموو ئایینەکان و مەزهەبە جیاوازەکان کرد بوو، جارێ لە رووی نەتەوەییەوە ئەوە بە حوکمی ئەوەی ئەو سەردەم سەردەمی عەقیدە بوو، هیچ ئاماژەیەکی بیری نەتەوەیی لەلا گەلاڵە نەبوو، تەنیا ئەوە نەبێت، کە نازناوەکانی هۆزەکەی یاخود هەرێمی شارەزوور، جار جارەش بە شاری هەمەدان ناسرا بوو ، هەرچی لە رووی مەزهەبییشەوە، مەلا گۆرانی دوای وردبونەوە و تێرامانی لە ناوەرۆکی مەزهەبەکان، ئەوە گەیشت بە ئەو ئەنجامەی کە مەزهەبی حەنەفی هەڵبژێرێت، بۆیە بەهۆی ئەوەی لە سیستەمی باوەریدا پشتی بە عەقڵ بەستبوو، هیچ کات دەمارگیریی نەبووە، لە منداڵییەوە کە پەیرەوی مەزهەبی شافعی کردووە، وە لەوکاتەی قوتابیش بووە فقهی شافعی

---

[1] گاشکۆبەری زادە ، ص ٥٢-٥٣

خوێندبوو، بەهۆی ئەوەی کە لایەنگری و دەمارگیری مەزهەبی نەبووە، دواتر بەبێ دوودڵی بووە، بە حەنەفی بەم پێیەش بێت، مەلا گۆرانی بەیەکەم زانای کورددادەنرێت، کە مەزهەبەکەی خۆی لە شافیعیەوە گۆڕی بێت بۆ حەنەفی.

### ٣. ٦: نەفس بەرزیی:

مەلا گۆرانی بە ئەندازەی جەستە درێژ و پان و پۆڕەکەی، نەفسیەتیشی بەرز بوو، لە سەرەتای ژیانیدا زۆر تاڵیی و کوڵەمەرگی بینی، بەڵام هەرگیز ڕۆژێك نەکەوتە داوی ماستەوچییەتی بۆ هیچ دەسەڵاتدارێك، ئەگەر ئەم کارە خراپە هونەر بێت، ئەوە بەڕاستی بۆ ئەم هونەرێکی ئاسان بوو ؟ چونکە خاوەنی زامنێکی ئەفسوناوی بوو لە قەناعەت پێهێنانی دەوروبەرەکەی، قەڵەمەکەی بۆ پیاهەڵدان زۆر بە بڕشت بوو، بەڵام نەك ئەو کارانەی نەدەکرد، بەڵکوو ئاراستەیەکی جیاواز لەبری بۆ ڕووبەڕووبونەوەی نەریتەکانی ئەوکات، شکێنەرێکی باشی بیدەعەکانی هردەمی خۆی بوو، باوەڕی بەوە بوو، کە ئەنجامی دەدا، شکۆی لە رادەبەدەری سوڵتانەکانی خستبووە ژێر پرسیار، کێ دەتوانێ نموویەك جگە لە مەلا گۆران بهێنیتەوە لەوەی کاتێك لە شوێنێك ڕووبەڕووی سوڵتان ببوایەتەوە، بەم شێوەیە هەڵسوکەوتی لەگەڵ کردوون، هیچ کات سەری بۆ هیچ دەسەڵاتدارێك دانەنواند، هەمیشە بە ناوی خۆیانەوە ناوی سوڵتانەکانی بردووە، تەوقەی لەگەڵ کردوون، بەڵام هیچ کات دەستی ماچ نەکردوون، حەزی بە چوونە کۆشك نەکردووە و

نەچووە، تەنها لەکاتی دەعوەتی بۆنەکان نەبێت، ئەمە ئەو وەسفەیە، کە مێژوونوسەکانی سەردەمی خۆی بۆیان کردووە.

لە ڕۆژێکی عەرەفەدا سولّتان بایەزیدی دووەم بە مەستی دەعوەت کردنی مەلا گۆرانی بۆ ڕۆژی جەژن، یەکێ لە پیاوەکانی دەنێرێت بە دوایدا، بەڵام مەلا گۆرانی بە مەبەستی نەچوونی بۆ لای سولّتان، دەڵێ وەرزەکە باراناویەو قوڕە، بە هۆی ئەوە هاتنمان زەحمەت دەبێت، سبەی جەژنە ئێمە ببەخشن، لە دوورەوە دوعاتان بۆ دەکەین، جەژنتان پیرۆزبیت، کاتێك هەواڵی نەچوونی گۆرانی بۆ دەعەوتەکەی سولّتان نەهاتووە، بەڵام سولّتان سوور دەبێت لەسەر ئامادەبوونی گۆرانی بۆ سبەی، بۆیە رجا لە مەلا گۆرانی دەکات کە بەیانی ئامادە بێت و پێی ڕادەگەینێت کە جەژنەکە بە ئێوەوە خۆشە، بۆیە ئەسپێکی بۆ دەنێرێت و ئەویش بۆ کۆشك دەچێت، و لەوێ دەست دەکات بە ئامۆژگاریکردنی.[1]

## ٧،٣:گومانی باش بردن:

مەلا گۆرانی نەك گومانی باشە بە دۆستەکانی دەبرد، بەڵکوو بۆ دوژمنەکانیشی هەروا بوو، ئەو پیاوێك بوو، چونکە هیچ کاتێك ڕقی لەنێو سینەی گل نەدەداوە، بۆیە هەمیشە گومانی باشی بە دەوروبەرەکەی دەبرد، ئەگەرچی جاری واهەبوو کە زۆر دڵنیا بوو، لەوەی ئەوە بەرامبەری دەکرێت، کارێکی خراپە، بەڵام ئەو هەمیشە بە گومانی باشی لێکدەدایەوە، دوای کێشەکەی مەلا خەسرۆ لەگەڵ مەلا گۆرانی، لە بابەتی بانگێشنامەکەی

[1] گاشکۆبەری زادە ، ص ٥٣

محەمەد فاتیح و دانانی مەلا گۆرانی لەلای راست، ئیتر لێرە بەدواوە مەلا خەسرۆ ڕقێکی زۆری بەرامبەر گۆرانی هەڵگرتبوو، بۆیە لە بۆسەی ئەوە دابوو کە ئاخۆ کەی مەلا گۆرانی پەرتووکێك بنووسێت و مەلا خسرۆ ڕەدی بداتەوە، هەر واشی کرد، سەرەڕای ئەم دژایەتییە ئاشکرایەی بۆ مەلا گۆرانی، بەڵام ئەم کارانەی بە چاکە لێکدەدایەوە، هەتا ئەو کۆمەڵە فەقێیەی کەسەر مەلا خەسرەو بوون و خۆش نودە نەبوون بە کەسایەتی مەلا گۆرانی، هێچ کاتێك هاووشۆو سەردانیان نەدەکرد، بۆیە رۆژێك دەربارەی زانایەك بەناوی شێخ وەفای، کە هەردەم سەردانی مەلا خەسرۆ دەکرد، بەلاّم هیچ کاتێك سەردانی مەلا گۆرانی نەدەکرد، لێیان پرسی کە بۆچی سەردانت ناکات ؟ ! مەلا گۆرانی وەلاّم دەداتەوە، کە:مەلا خەسرۆ هەم عاملە، هەم عالمە، سەردانی کردنی پێویستە، بەلاّم من ئەگەر زاناشبم، چونکە تێکەڵم لەگەڵ دەسەلاّتداران، بۆیە سەردانی کردنم دروست نییە.[١]

### ٨,٣:بوێریی:

لەپاڵ زانستەکەی، بەڵام بوێرییەکەی کردی بەو زانایەی، کە ئێستا ئێمە باس لە ژیانی دەکەین، مەلا گۆرانی ئەو زانا چاونەترسەی، کە سڵی لە هیچ زوڵم و نادادییەك نەدەکرد، چەندین جار باجی ئەم هەڵوێستانەی دەدا، کەمترین سەرپێچیی شەرعی لە هەر کەسێك ببینیایە، راستەوخۆ ئاگاداری دەکردەوە، لەبارەی ئەحکامی شەرعەوە، موجامەلەی سوڵتانی نەدەکرد، هەموو کاردانەوەیەکی پێشبینی نەکراوی ئەنجام دەدا، باشترین نموونەش کیشەیەکەتی لەگەڵ سوڵتان محەمەد فاتیح بوو، کاتێك

---

[1] عبدالكريم المدرس : ص ٧٢

نامەیـەکی بـۆ دەنـیرێ، کـە فـەرمانێك بـە مـەلا گـۆرانی دەکـات، بـەلاّم نـاوەڕۆکی فەرمانەکـە پێـچەوانەی شـەرعە، بۆیـە بەتوڕەییـەوە نامەکـە دەدڕێنێـت و نامەبەرەکـەش لـەبری هێنـانی نامەکـە کـە وەکـو هاوکـاری خراپەکاری بووە، سزا دەدات.

بەردەوام ئامۆژگـاری دەسـەلاّتدارەکانی دەکـرد، زۆ بـەڕوونی و بـە بـێ پـێچ و پـەنا، بـە سـولّتانی دەگـوت:ئـەی سـولّتان تـۆ ماڵەکـەت حەرامـە، جلەکانت حەرامە ! بۆیە ئاگات لە خۆ بێت.

ڕۆژێـك مـەلا گـۆرانی بـە شـێوەی شـیکایەت بـە محەمـەد فـاح دەڵێـت کەوا:تەیمورخان کەسێکی بۆ ئیشێك نـارد بـوو، بـە پۆستەچـیەکەی وتبـوو، گەر پێویستیت بە ئەسـپ هەیـە، هـی هـەر کەسـێکت بینـی بیبـە، گـەر هـی شارۆخی کوڕیشم بێت، جا ئەو پۆستەچییەی بۆ لای مەلا گۆرانی نێردرا بوو، لە ڕێگادا دەگاتە سعدین تفتازانی، کە لە چاردەکەیی دانیشتبوو، ئەسـپێکی ئـەم دەبـات، بۆیـە سـەعدەدینیش بـە شـێوەی سـکالاّ هـەواڵی ئـەم کـارە نابەجێیە بە مەلا گۆرانی ڕادەگـەیێنێت. مـەلا گـۆرانیش بـە لێـدانێکی بـاش، سزای دەدات، بەمەش پۆستەچییەکە هەواڵی لێـدانی بـە تـەیمور دەگـەینێ، هـەر بۆیـە تـەیمورخان لـەم کـارەی مـەلا گـۆرانی زۆر تـوڕە دەبێـت و دەڵێت:ئەگەر ئەوە شارۆخی کـوڕم بوایـە، دەمکوشـت، بـەلاّم چـۆن پیاوێـك بکوژم، کە پەرتووکەکانی پێش شمشێری من چووە بـۆ وڵاتـان، دواتـر مـەلا گـۆرانی بـە تـەیمور دەڵێـت: ئێـستا کتێبـەکانم لـە مەککـە دەخوێنرێـت، شمشێرەکەی تۆش بەوێ نەگەیشتووە. محەمەد فاتیحیش وەکـو پـشتگیری لە مەلا گۆرانی وەلاّمی دایەوە، وتی:بەڵێ ئەی مەلا و گەورە.[1]

[1] گاشکوبەری زادە : ص –٥٤

**٩,٣ :يادگاری:**

مەلا گۆرانی پیاوێکی زیرەك بوو، لە کاتی پێویستی وەلأمی گونجاوی هـەبوو، هـیچ کاتێـك قـسەی لێنـەدەبڕا، وەکـو باسمـان کـرد هەمیـشە ئامۆژگـاری محەمـەد فـاتیحی دەکـرد، دەیگـوت تـۆ ماڵەکـەت حەرامـە، جلەکانت حەرامە، خواردنەکەت حەرامە، ئاگاداری خۆت بە !

رۆژێك مەلا گۆرانی لەگەڵ سوڵتان محەمەد فـاتیح لـە یـەك سـێنی نـان دەخۆن، فاتیح ئەمە بە فرسەت دەزانێ و بە مەلا گۆرانی دەڵێت:

مەولام تۆ بە منـت گـوت خوادنەکـەت حەرامـە، کەچـی ئێـستا خـۆت لەگەڵم، ئەم حەرامە دەخۆیت ؟!

مەلا گۆرانی وەلأمی دایەوە:بەڵێ گوتوومە، بەڵام ئەو بەشەی لە پـێش تۆ دایە حەرامە، وە ئەو بەشەی لە بەردەم من دایە حەڵاڵە.

دوای کەمێك لە قسە و گفتوگـۆ محەمـەد فـاتیح سینیەکەی سـوڕاند و خواردنەکەی پێچەوانە کردەوە، بە مەلا گۆرانی گوت:

ئیستا تۆ لە خواردنە حەرامەکە دەخوایت و منیش لە حەڵاڵەکە.

گۆرانی وەلأمی دایەوە:من بەشە حەڵاڵەکەم خـوارد، حەرامەکـە بـۆ تـۆ مایەوە، تۆش حەرامەکەت خوارد و بەشە حەڵاڵەکەش بۆ من مایەوە.[١]

[1] گاشکوبەری زادە : ص ٥٣-٥٤

## ٤. مەلا گۆرانی لە ناوەندە ئەکادیمییەکانی دونیا:

لە بارەی ژیان و بەرهەمەکانی مـەلا گـۆرانی، تـا ئێـستا چـەندین تێـزی دکتۆرا و نامەی ماستەر و توێژینەوەی ئەکادیمی کـراوە، ئەمـە سـەرەڕای ئەوەی بەشێك لە پەرتووکەکانی لەلایەن زانایان تحقیق کراوە، لە ڕاسـتیدا ئەمەش پێگە و گەورەیی ئەو پیاوە دەردەخات ، لەهەمان کاتدا بێئاگایی ئێمەی میللەتی کورد لە زاناکانی خۆمان نیشان دەدات، لە ئەمین زەکـی و مەلا عەبدولکەریم مودەڕیس، کە بە چەند لاپەڕەیەکی کەم نەبێت، باسیان کردووە، ئەگینا تا ئێستاش تەنانەت تا ئەو شوێنەی ئێمە ئاگادار بین یەك توێژینەوەی بەکالۆریۆس نەکراوە، کە ئەمەش جێگای داخە، بۆیـە ئێـستا یەکەیەکـە دێینــە سـەر ئــەو هەولّـە ئەکادیمییانـەی کـە لـەبارەی ژیـان و بەرهەمی مەلا گۆرانی کراون، لەوەشدا تورکیا پشکی شـێری بەردەکـەوێت و دواتر سعودیە و میسر :

### ١،٤: ولأتی تورکیا

- ساکیب یلّدز، یەکەم تێزی دکتۆرایە، لە تورکیا بەرواری ١-١-١٩٨٨ بەدەستی هێناوە، ناونیشانی ئەم توێژینەوەیـە بـە نـاوی (مامۆسـتای محەمەد فاتیح مەلا گۆرانی و تەفسیرەکەی ). کە ٣٦٢ لاپەڕە لە خـۆ دەگرێت، هەولّێکی زۆر ناوازەی یلـدزە، کـە پێدەچـیّ مانـدووبوونێکی زۆری لەگــەلّ ئــەم توێژینەوەیــە چێــشتبێت، نزیکــەی ١٠٠ لاپــەڕەی توێژینەوەکەی تەرخان کردووە بۆ ژیان و بەرهەمەکانی مـەلا گـۆرانی، باقیەکەی تریشی بۆ تەفیسرەکەی ، بەڕێز یلّدز لـەو کاتـەی سـەرقالّی

توێژینەوەکە بوو بەداخـەوە بـواری تەکنـەلۆژی وەکـو ئـەوەی ئێـستا پێـشکەوتوو نــەبوو، بۆیــە لــە زۆرێـك لــە سەرچـاوە عەرەبییــەکانی سەردەمی مەلا گۆرانی بە دەست نەگەیشتووە، وە بەشێکیتریـشی لـە دەسـتی دوو و سـێ وەرگرتـووە، بۆیـە لـە هەنـدێ شـوێن کەوتۆتـە هەڵەوە، ئەمە جگە لەو فشارە ناسیۆنالیزمییە تورکییەی ئەوکاتی کـە لەسەر بووە، بۆیە لە بارەی رەچەڵەکی گۆرانییەوە، کەمێك لـە بـوارە ئەکادیمییەکەی لای داوە، ئەم هەڵەش بەداخەوە شـۆڕبۆتەوە بـۆ نـاو یەکـە ئەکادیمییـەکان، بـووە بـە بنەمایـەکی زانـستی، وەکـو ئـەوەی پێشووتر لە بابەتی شوێنی لەدایکبوونی مەلا گۆرانی باسمان کرد، کـە یڵدز ڕەچەکی گـۆرانی بردۆتـەوە ناوچـەیەکی کوردسـتانی تورکیـا بـە ناوی هیللەر، بەڵام  لە ڕاستیدا لەبارەی بەشی دووەمی سەرچـاوەکان کە ئەویش بریتییە لـە بەڵگەنامـەی عوسمـانیی و سەرچـاوەی تـورکی هیمــەتێکی باشــی کــردووە، چــەندین گرێــی کردۆتــەوە، هەرچــی پەیوەندی بە بەشە زۆرەکەی هەیە، کە بریتییە لە تەفسیرەکەی مـەلا گۆرانی، دوای تەفسیرەکە، لەگەڵ ئایەتەکەدا، بۆچوونی خۆشی داوە.




بەرگی دکتۆراکەی ساکیب یڵدز

- دکتۆرای دووەم کە ئەمەیان تایبەتە بە بەشێك لە تەفسیرەکەی مەلا گۆرانی (غاية الأماني في تفسير الكلام الربان ) لە لایەن توێژەر محەمەد موصتەفا گۆگسو ئامادەکراوە، ئەم توێژینەوە، پێشکەش بە زانکۆی سەقاریە کراوە، بە زمانی عەرەبی نووسراوە، بە ناونیشانی (غاية الأماني في تفسير الكلام الرباني من أول سورة النجم إلى آخر

سورة الناس)  ساڵی ٢٠٠٧ ز، ناوەڕۆکی دکتۆراکە بریتییە لە بەشێکی تەفسیرەکەی مەلا گۆرانی  لە سەرەتای سوڕەتی) نەجم (تاوەکو کۆتایی جزئی سییەمی سورەتی) الناس) کۆتایی پێدێت. توێژەر هۆکاری ئەم بابەتەی لە چەند خاڵێك ڕیز کردووە،وەکو  دەڵێت:بەر لە هەموو شتێك، ئێمە خزمەتێك بە قورئانی پیرۆز دەکەین، سەرەڕای ئەوەی  نووسەری تەفیسرەکە مەلا گۆرانی، شوێنێکی بڵندی لە پایەی زانستی نێو زاناکانی سەردەمی خۆی هەبووە، لەگەڵ شارەزاییەکی زۆریشی لە تەفسیر و حەدیس و مەنتیق و نحو دا هەبووە، ئەمە جگە لەوەی تەفسیرەکە بەرپەچدانەوەی و پاککردنەوەی تەفیسری زەمەشخەری و بەیزاوییە، لەگەڵ چەندین بەهانەی تر.

لینکی توێژینەوەکە بە زمانی عەرەبی دەتوانن لەو دوو لینکەی خوارەوە وەریبگرن:

http://media.tafsir.net/ar/books//538/Ghayat_Alamany.pdf
http://www.tafsir.net/scholar/538

الجمهورية التركية
جامعة صاقريا

غاية الأماني في تفسير الكلام الرباني

لشهاب الدين أحمد بن إسماعيل الكوراني

من أول سورة النجم إلى آخر سورة الناس

دراسة وتحقيق

رسالة مقدمة لنيل درجة الدكتوراه في التفسير

إعداد:

محمد مصطفى كوكصو

معهد العلوم الاجتماعية
قسم العلوم الإسلامية الأساسية

نوقشت هذه الرسالة ٢٥/٠٥/ ٢٠٠٧م من قبل لجنة من الأساتذة وتم قبولها بالإجماع.

أ.د. ولي أولوترك    أ.د. علي أرباش    أ.د. داود آيدوز

الأستاذ المشارك/د. محمد آيدين    أ.د. يعقوب جيجك

- ناونشانی ماستەرنامەی (yhülislam Molla Gürani، hayatı، eserleri ve tefsirdeki metodu) شەیخولئیسلام مەلا گۆرانی، ژیانی، بەرهەم و میتۆدی تەفسیرەکەی ) لەلایەن قوتابی عبدوجەبار ئاڵتون ئامادەکراوە، لە ساڵی ١٩٩٦ لە زانکۆی ١٩ مایس ئەنجامدراوە، هەر چەندە هەوڵی زۆرمان دا کە ئەو نامەیە بەدەستخەین و سوودی لێوەرگرین، بەڵام بە داخەوە تەنها بەرگەکەمان دۆزییەوە، وەکو دیارە کە نامەکە لە سێ بەش پێك هاتووە، ئەویش ژیانی مەلا گۆرانی و بەرهەمەکانی، وە مەنهەجی لە نوسینی تەفسیرەکەی.

yetinde bir " Sonuç " la tamamlanmıştır.

93802

T. C.
ONDOKUZ MAYIS ÜNİVERSİTESİ
Sosyal Bilimler Enstitüsü
Temel İslam Bilimleri Anabilim Dalı

ŞEYHULİSLÂM MOLLA GÜRÂNİ
HAYATI , ESERLERİ VE TEFSİRDEKİ METODU



( YÜKSEK LİSANS TEZİ )



Hazırlayan
Abdulcebbar ALTUN

Danışman
Doç. Dr. İshak YAZICI



SAMSUN - 1996

STELAE TURCICAE. VII.
DEUX CIMETIÈRES PRÈS DE FINDIKZADE À ISTANBUL:
MOLLA GÜRANİ ET PİRİ MEHMED PAŞA
J.-L. BACQUÉ-GRAMMONT, S. EYİCE, N. CLAYER et Th. ZARCONE 265

- ناونیشانی نامەی ماستەرێکی تر ( Molla Gürani'nin 'Gayetu'l-Emani' isimli tefsiri ve tefsirinin Fatiha ve Bakara surelerinin 1-103 ayetlerinin edisyon kritiği) مەلا گۆرانی تەفسیری غایەتولئەمانی لە سەرەتای سورەتی) فاتیحە) تاوەکو ئایەتی ١٠٣ سورەتی البقرە ) کە لە لایەن قوتابی توێژەر محەمەد ئای لە ساڵی ٢٠٠٣ زانکۆی مەڕمەڕە، بە زمانی تورکی ئەنجام دراوە، ئەم نامەیە تایبەتە بە جوزئی یەکەم، لەخۆدەگرێت.

Molla Gürani ve El-Kevseru'l-Cari adlı Buhari şerhi5

(ناونیشانی الکوثر الجاري إلى رياض أحاديث البخاري – ماستەرنامەیەکە، کە لە لایەن قوتابی توێژەر (سەلیم دەمیرچی) لە زانکۆی مەڕمەڕە لە ساڵی ٢٠٠٩ بە ئەنجام دراوە، کە ئەم نامەیە تایبەتە بە کەوسەری جاری مەلا گۆرانی، تیایدا راڤەی فەموودەکانی نێو پەرتووکی ئیمامی بوخاری کردووە.

## ٢,٤ :عەرەبستانی سعوودیە:

عەرەبستانی سعودیش بێ بەش نەبووە لە خێر و بەرهەمی مەلا گۆرانی، تا ئیستا ئەوەندەی دۆزیبمانەتەوە چەند نامەی ئەکادیمی لە بارەی مەلا گۆرانی کراوە.

١- نامەیەکی دکتۆرا بە ناونیشانی (غاية الأماني في تفسير الكلام الرباني احمد بن إسماعيل الكوراني) من أول سورة الأنفال إلى آخر سورة إبراهيم دراسة وتحقيقاً) لە لایەن توێژەر محەمەدکوڕی سريع الرسيع ئامادەکراوە، ئەم دکتۆرایە بریتیە لە دوو بەشی سەرەکی کە نزیکە لە هی ساکیب یلدز، لە بەشی یەکەم تەرخان کراوە بە ژیانی مەلا گۆرانی و بەرهەمەکانی و مردنی ، لەگەڵ مامۆستا و قوتابییەکانی، ئینجا باس لە کورتەیەك لە سەر ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و زانستی دەکات، ئینجا دێتە سەر تەفیسرەکەی مەلا گۆرانی، و دوای پێناسسە کردنی لەبارەی مەنهەج و میتۆدی تەفیسرەکە قسە دەکات، دواتر لە سەرەتای سورەتی ئەنفال تاوەکو کۆتای سورەتی ئیبراهیم، تەفیسر دەکات، هەرچەندە بەداخەوە توێژەر تەنها ناونیشانی تێزەکەی بڵاو کردۆتەوە.

٢- تێزەکی تری دکتۆرا، کە لە وولاتی سعودیە لە زانکۆی (ام القری) لە بارەی پەرتووکێکی مەلا گۆرانی ( لوامح الغرر شرح فرائد الدرر ) لە لایەن توێژەر ناسرکوڕی سعود لە ساڵی ٢٠٠٦ بەدەستهاتووە، کە توێژینەوەکە ئەم تەوەرانەی لەخۆگرتووە، بەشی یەکەم لە بارەی ژیان و بەرهەمەکانی مەلا گۆرانی دواوە، دواتر مامۆستاو قوتابییەکانی، وەفاتکردنی، لە بەشی دووەم تایبەتی کردووە بۆ ئەم پەرتووکەی مەلا گۆرانی، لەبارەی پێناسە و گرنگی دواوە، لەگەڵ لێکۆڵینەوە لە ناوەرۆکی پەرتوکەکە.

٣- تێزەکی تر هەر لەبارەی تەفیسرەکەی مەلا گۆرانی، کە وڵاتی سعودیە لە زانکۆی (ئیمام محەمەدکوڕی سعود) کە لە ساڵی ٢٠٠٢ لە لایەن توێژەر عبداللە عەلی کراوە، بە سەرپەرشتی جومعە سهل کە ناونیشانەکەی بریتییە لە (غاية الاماني في تفسير الكلام الرباني:من أول سورة "يس" الى آخر سورة "الطور "_)

٤- تێزەکی تر هەر لەبارەی تەفیسرەکەی مەلا گۆرانی، کە وڵاتی سعودیە لە زانکۆی (ئیمام محەمەدکوڕی سعود) کە لە ساڵی ٢٠٠٢ لە لایەن توێژەر یوسف عبدالعزیز، بە سەرپەرشتی ئیبراهیم سلێمان لە ژێر ناونیشانی (غاية الاماني في تفسير الكلام الرباني:من أول سورة "النساء " الى آخر سورة "الاعراف "_)

٥- تێزەکی تر هەر لەبارەی تەفیسرەکەی مەلا گۆرانی، کە وڵاتی سعودیە لە زانکۆی ( ئیمام محەمەدکوڕی سعود)، کە لە ساڵی ٢٠٠٢ لە لایەن توێژەر حامد یعقوب، بە سەرپەرشتی محەمەد کوڕی ال صالح لە

ژێر ناونیشانی (غاية الاماني في تفسير الكلام الرباني:من أول سورة الفاتيحة الى آخر سورة آل عمران ).

٦- تێزەکی تر لەبارەی تەفسیرەکەی مەلا گۆرانی، بە ناونیشانی (غاية الاماني في تفسير الكلام الرباني من اول سورة المؤمنون الى آخر سورة فاطر" ) لە لایەن توێژەر هادی علی لە (جامیعەی ئیمام )محەمەد بن سعود بە سەرپەرشتی محەمەدکوڕی عمر لە ساڵی ٢٠٠٣ ئەنجامدراوە.

٧- تێزەکی تر لە بارەی پەرتوکی (كشف الاسرار عن قراْة الائمة الاخيار) کە شاکارێکی تری مەلا گۆرانیە، لە وڵاتی سعودیە و لە (جامیعەی محەمەدکوڕی سعود) لە لایەن توێژەر عبدالله بن حماد القريشى، بەسەر پەرشتی محەمەدکوڕی عمر، لە ساڵی ٢٠٠٧ ئەنجام دراوە.

٨- تێزەکی تر لەبارەی پەرتووکی (الدرر اللوامع فى شرح جمع الجوامع)، کە شاکارێکی تری مەلا گۆرانییە، لە وڵاتی سعودیە، لە جامیعەی (ئیسلامی) لە لایەن توێژەر سعيد بن غالب ، کە دواتر کراوە بە پەرتوکێکی هاوبەش لەگەڵ عبدالوهاب کوڕی علی، لە ساڵی ٢٠٠٨ بڵاو کراوەتەوە.

٩- تێزەکی تر لە بارەی تەفسیرەکەی مەلا گۆرانی بە ناونیشانی (غاية الاماني في تفسير الكلام الرباني:من سورة الحجر إلى آخر سورة الحج" )، لە لایەن توێژەر عەباس بن حسێن لە جامیعەی ئیمام محەمەدکوڕی سعود بە سەرپەرشتی زەکی کوڕی محەمەد لە ساڵی ٢٠٠٢ ئەنجامدراوە.

١٠- تێزەکی  تر لەبارەی تەفسیرەکەی مەلا گۆرانی بە ناونیشانی (غایه الامانی فی تفسیر الكلام الرباني ن أول سوره النجم إلى ئخر الكتاب. تحقيقاً ودراسه )  له لايەن توێژەر جوهره محەمەد عەنقری له جامیعەی ئیمام محەمەد کوڕی سعود بە سەرپەرشتی محەمەد صالح لە ساڵی ٢٠٠٢ ئەنجامدراوە.

١١- الكوثر الجاري إلى رياض أحاديث البخاري ئەم پەرتوكەی مەلا گۆرانی دووجار تەحقیقی بۆ کراوە، جاری یەکەم لەلایەن **الشیخ ئەحمەد عزو عنايه** لێکۆلینەوەی بۆ کراوە، کە لە ٢٧ تشرینی یەکەمی ٢٠٠٧ لە تەحقیق کردنی ئەم پەرتوکە تەواو بووە، لە دیمەشق، کە ١١ بەرگ لە خۆ دەگرێت.

لینکی پەرتووکە کە:

http://shamela.ws/index.php/book/16584

جاری دووەمیش هەر ئەم پەرتوکە ( الكوثر الجاري إلى رياض أحاديث البخاري )لە لایەن محەمەد بن ریاز لە ساڵی ٢٠٠٢ تەحیقیق کراوە، لە دوو تۆێی ١٢ بەرگ  و لە وولاتی لوبنان بەچاپ گەیشتووە.

لینکی پەرتووکە کە:

http://waqfeya.com/book.php?bid=11161

## ٣,٤:- ولاَتى ميسر:

له ولاَتى ميسريش ئەم توێژینەوانە لە بارەی مەلا گۆرانی و بەرهەمەکانی کراون.

١. نامەیەکی ماستەر لەبارەی تەفسیرەکەی هاتووە، بە ناونیشانی) تفسير غاية الأماني في تفسير الكلام الرباني للإمام الكوراني ( دراسة ونقد (من أول سورة الصافات إلى آخر سورة الرحم)" له) جامیعەی ئەزهەر (لە ساڵی ٢٠٠٦ ، لە لایەن توێژەر محەمەد ئیبراهیم سەید غانم.

٢. نامەیەکی تری ماستەر لە بارەی تەفسیرەکەی هاتووە بە ناونیشانی تفسير غاية الأماني في تفسير الكلام الرباني للإمام الكوراني " دراسة ونقد دراسة ونقد من أول سورة الفرقان إلى آخر سورة يس" لە (جامیعەی ئەزهەر) لە ساڵی ٢٠٠٨ ، لە لایەن توێژەر ئەحمەد محەمەد عوز ئەنجامدراوە.

٣. نامەیەکی ماستەری تری لەبارەی تەفسیرەکەی هاتووە، بە ناونیشانی ( تفسير غاية الأماني في تفسير الكلام الرباني للإمام الكوراني من أول سورة الفاتيحة إلى آخر الجزء الأول من سورة البقرة" لە (جامیعەی ئەزهەر) لە ساڵی ٢٠٠٨ لە لایەن توێژەر موستەفا محمود ئەنجامدراوە.

٤. نامەیەکی ماستەری تری لەبارەی تەفسیرەکەی هاتووە بە ناونیشانی ( تفسير غاية الأماني في تفسير الكلام الرباني للإمام الكوراني من أول سورة يونس إلى آخر سورة النحل ) لە (جامیعەی ئەزهەر) لە ساڵی ٢٠٠٨ ، لە لایەن توێژەر رەمەزان عەوز ئەنجامدراوە.

٥. نامەیەکی تری ماستەر لە بارەی تەفسیرەکەی هاتووە بە ناونیشانی ( تفسير غاية الأماني في تفسير الكلام الرباني للإمام الكوراني من أول سورة الواقعة إلى آخر سورة الناس " لە (جامیعەی ئەزهەر) لە ساڵی ٢٠٠٨ ، لە لایەن توێژەر سەمیر محمود الشعراوی ئەنجامدراوە.

٦. نامەیەکی تری ماستەر لەبارەی تەفسیرەکەی هاتووە بە ناونیشانی ( تفسير غاية الأماني في تفسير الكلام الرباني للإمام الكوراني دراسة ونقد من أول سورة الإسراء إلى آخر سورة النور ) لە (جامیعەی ئەزهەر) لە ساڵی ٢٠٠٧ ، لە لایەن توێژەر محەمەد کمال ئەنجامدراوە.

٧. نامەیەکیتری ماستەر لەبارەی تەفسیرەکەی هاتووە بە ناونیشانی ( تفسير غاية الأماني في تفسير الكلام الرباني للإمام الكوراني دراسة ونقد لتفسير سور الأنعام والأعراف والأنفال والتوبة ) لە (جامیعەی ئەزهەر) لە ساڵی ٢٠٠٧ لە لایەن توێژەر سامح ئیبراهیم ئەنجامدراوە.

٨. نامەیەکی تری ماستەر لەبارەی تەفسیرەکەی هاتووە بە ناونیشانی (تفسير غاية الأماني في تفسير الكلام الرباني للإمام الكوراني من أول سورة آل عمران إلى نهاية سورة المائدة ( ( دراسة ونقد" ) "لە (جامیعەی ئەزهەر) لە ساڵی٢٠٠٦ ، لە لایەن توێژەر رەفعت بسیونی ئیسماعیل ئەنجامدراوە.

# The life and Career of Molla Gurani

The auther Didar Othman addresses the life and career of Mollah Gurani ,the fourth Shaykh al-Islam of the Ottoman State and the tutor of Fatih Sultan Mehmed Han. The full name of Gurrani is Ahmad bin Ismâil bin Osman Gurani, the nickname is Şerefüddin and Şihâbüddîn. In 1410 (813 AD) he was born in a village connected to Sharizour in sothern Kurdistan. He died in Istanbul in 1488 (H 893).He was a valuable scholar in the knowledge of tafsir, kraat, hadith and jurisprudence. Gradually he became known and began to teach at the medieval towns of the Egypt ,Syria. and Anatolia. The scholars who listen to his lectures appreciated the supremacy in his presence. His teacher Ibn-i Hajar Askalanî, who saw personally that he had read Sahîh-i Buhârî with a very good skill, gave him his consent. After that, a part of his life passed through Cairo and Damascus and came to Anatolia. The arrival in Anatolia has been another phase in his life.

The author narrates the life of Gurani and his various travels in the Middle East and gives a vivid account of his acheievnenmet and significance with which he had been accorded by Sultan Muhammed Fatih. The writer addresses some cotroversial issues about the place of birth of Gurani , his social and academic disputes with other schollars of Ottoman court. The book is a good contribution to the histroyography of Islamic civilization. Mr.Didar in this study which draws upon Ottoman and Arabic sources demonstartes that Gurani

had a profound impact on Sultan muhamed Fatih'S decision to open Constatinopole. He also maintains that Gurani was a man of integrity and good morals and had never allowed himself to be used by officials of the Ottoman court.

When he was young, Molla Gurani, studied college in his own country. After that,he went to the cities of Baghdad, Diyarbakir, Him and Haifa, and at the age of seventeen, he went to Damascus and continued to the lessons of well-known scholars and increased the number. He went to the Sheikh from Damascus and read works from the most famous scholar Ibn-i Hajar Askalani, who had been in about the hadith and fiqh. Among the works he read from this lecturer were the Sahih al-Bukhari and the famous works of fiqh. After Molla Gurani completed the collection for this shaikh; he became known as a valuable scholar in the knowledge of tafsir, kraat, hadith and jurisprudence. He began to teach at the medieval towns of the Syria and Egypt. The scholars who listened to the lesson appreciate the supremacy in his presence. His teacher Ibn-i Hajar Askalanî, who saw personally that he had read Sahîh-i Buhârî with a very good skill, gave him his consent. After that, a part of his life passed through Cairo and Damascus and came to Anatolia. The arrival in Anatolia has been another phase in his life.

İn order to demonstrate the initimate relations between Sultan Muhammed Fatih and Gurani , the author writes that while he was in Egypt Ottoman Sultam wanted him back but Mamluke leader tried to convince him not to leave Egypt. Didar writes , When

Molla Gurani arrived in Egypt, he received a full acceptance from the Egyptian sultan, Kaybay, and many respects. After a while, the Sultan asked Mehmet Han to send Moltra Gurânî to Kaytbay, the Egyptian Sultan. Registrar informed Molla Gurânî of this recitation of Sultan Mehmed the Conqueror; "Do not go, I will give you more pleasure and glory than his," he said. Molla Gurânî; "Yes, I believe, I have seen many incentives from you. However, there is a great love between me and him, as between father and son. This incident between us is another thing. He knows that if I do not go to him, he thinks that I have not been sent by you, and that you can go into hostility. " Regarding this reply, Sultan Kaybay gave him a lot of money and goods that could be needed on the way and sent great gifts to Sultan Mehmed the Great".

To sum up this study by Didar should be viewed within the contexts of similar studies written by other writers ın the field such as Muhammed Ali , Amin Zaki , and Ayotollah Mardokhi , which demonstrate the considerable contribution Kurdish scholars have made to the Islamic civilization

## ٥. سەرچاوەکان:

١. جلال الدين السيوطي المتوفى:911هـ: نظم العقيان في أعيان الأعيان، فيليب حتي،1927 ، المكتبة العلمية - بيروت

٢. احمد بن علي المقريزي تقي الدين 845 توفي:درر العقود الفريدة في تراجم الأعيان المفيدة، إحياء التراث العربي / وزارة الثقافة، سوريا 1995مجلد 1

٣. عمر بن رضابن محمد راغب بن عبد الغني كحالة الدمشق (المتوفى:408هـ (:معجم المؤلفين، مكتبة المثنى - بيروت، دار إحياء التراث العربي بيروت

٤. عمر رضا كحالة:المنتخب من مخطوطات المدينة المنورة:مكتبة عارف حكمت، المنتخب تم نشره عبر 6 أعداد من مجلة مجمع اللغة العربية بدمشق، خصص الجزء الأخير للمكتبة المحمودية. 2011

٥. حمد بن علي ابن حجر العسقلاني ( 853 - 773ه (إنباء الغمر بأنباء العمر، المحقق:حسن حبشي الجزء الرابع، القاهرة 1998، ص158 .

٦. اسماعيل باشا البغدادي ( 1920م. (:هديه العارفين اسماء المؤلفين و اثار المصنفين، طبعه استانبول سنه1951 ،

٧. حاجي خليفة:كشف الظنون عن أسامي الكتب والفنون، محمد شرف الدين يالتقايا، الناشر:دار إحياء التراث العربي بيروت، جلد 1،

٨. البقاعي ( ت 885 هـ ( :عنوان الزمان بتراجم الشيوخ والأقران،حققه الدكتور حسن حبشي مع الباحثة إزيس زكا قرياقص، و

صدر الجزء الأول منه عن دار الكتب و الوثائق القومية بالقاهرة سنة:2001ـ

٩. المولى تقي الدين بن عبد القادر التميمي الدّاريّ الغزّيّ الميسريّ الحنفيّ المتوفي سنة 1005 هـ ( 1010هـ، الطبقات السنية في تراجم الحنفية، الجزء الرابع ، المحقق:د .عبد الفتاح محةمةد الحلو، دارالرفاعي، القاهرة 1970

١٠. شمس الدين أبو الخير محمد بن عبد الرحمنكورِىمحمد بن أبي بكربن عثمان بن محمد السخاوي (المتوفى:902هـ):الضوء اللامع لأهل القرن التاسع، منشورات دار مكتبة الحياة – بيروت، الجزء الاول.

١١. محمد بن علي الشوكانى:البدر الطالع بمحاسن من بعد القرن السابع، دار الكتاب الإسلامي تصوير، جزء الاول.

١٢. عادل نويهض:معجم المفسرين» من صدر الإسلام وحتى العصر الحاضر «قدم له:مُفتي الجمهورية اللبنانية الشَّيْخ حسن خالد،:مؤسسة نويهض الثقافية للتأليف والترجمة والنشر، بيروت – لبنان، الطبعة:الثالثة، 1409 هـ - 1988 م.

١٣. محمد عبد الحى اللكنوى الهندي أبو الحسنات (- 1264 1304هـ = 1848 - 1887 م):الفوائد البهية في تراجم الحنفية، المحقق:محةمةد بدر الدين أبو فراس النعاني، دادرالكتاب الاسلامى قاهيرة.

١٤. احمد بن مصطفى بن خليل، أبو الخير، عصام الدين طاشْكُبْري زَادَهْ (المتوفى:968هـ):الشقائق النعمانية في علماء الدولة العثمانية، دار الكتاب العربي – بيروت .

١٥. نور عثمانه كتبخانه سنده محفوظ كتب موجوده نك دفترى در (استانبول) تركيه-استانبول

١٦. کوردەکانی ئەستەنبۆلی کۆن ( 1453-1925) وەرگێرانی ئەحمەد تاقانە، کوردستان هەولێر2005 .

١٧. العلامة الشيخ عبد الكريم المدرس:علمائنا في خدمة العلم والدين، الطبعة الأولى 1403 هـ1983 =.

١٨. تاريخ مشاهير كرد (عُرفا، علما، اُدبا، شعرا) جلد اول / بابا مردوخ روحاني شيو 1382 / طهران.

١٩. محمد امين زكي:تاريخ سليمانية، بغداد1951 .

٢٠. زرار صديق:هۆزی گۆران ڕۆڵی سیاسی و رۆشنبیری،گۆڤاری ئەكادیمی، هەولێر ٢٠٠٦.

٢١. مەستورەی کورستان:میژووی ئەردەلان، ساغکردنەوەی هەژار موکریانی، دەزگای ئاراس ٢٠٠٢

٢٢. ڤلادیمێر مینۆرسکی:مینۆرسکی کورد، وەرگێڕانی ئەنوەر سوڵتانی، دەزگای موکریان چاپی دووەم ٢٠٠٦.

٢٣. القبائل الكردية، ترجمة اجمد محمود الخليل.

٢٤. ابن فضل الله شهاب الدين العمري:الكتاب:مسالك الأبصار في ممالك الأمصار، دار الكتب العلمية،2010 ، مجلد 3.

٢٥. دوریە عەونی، مەحمود زاید، موستەفا عەوەز:کورد لە میسر بە درێژایی سەدەکان، وەرگیرانی حسین موستەفا، 2013

٢٦. د. فرست مرعي:الجذور التاريخية للتغلغل الشيعي في كردستان،2013/06/26 ، مجلة البيان.

٢٧. ياقوتكورِىعبد الله الحموي الرومي البغدادي شهاب الدين أبو عبد الله:معجم البلدان، مجلد2 ، دار صادر 1993

٢٨. خير الدين الزركلي:الأعلام قاموس تراجم، دار العلم للملايين، 2002

٢٩. موحسين مامل:كوردستان لە كتێبی تەقويم ئەبولدانی ئەلبولفيدای ئەيوبی، خانەی موكريان، هەولێر ٢٠١٤

٣٠. السير وليم موير:تاريخ دولة المماليك في ميسر، ترجمة:محمود عابدين – سليم حسن، مكتبة مدبولي، الطبعة:الاولى1995 م.

٣١. مجاهد محمد:الحياة العلمية في الدولة املمك البحرية، سودان . 2011

٣٢. ابن حجر العسقلاني، احمد بن علي - الموسوعة العربية الميسرة، 1965 وزارة الثقافة — ميسر.

٣٣. تاهير بەحركەی:میژووی زانایانی کورد، بەرگی یەکەم.

٣٤. تقي الدين الغزي:المولى تقي الدين بن عبد القادر التميمي الدّاريّ الغزّيّ الميسريّ الحنفيّ المتوفي سنة 1005 هـ، الطبقات السنية في تراجم الحنفية، المحقق:د .عبد الفتاح محەمەد الحلو، جزء الاول.

٣٥. يلماز اوزتونا:تاريخ الدولة العثمانية، ترجمة عدنان محمود، محمود الانصارى، مجلد الاول، استانبول1988 .

٣٦. ئيبن و كەسير:تەواور مێژوو، و زاهير محەمەد، بەرگی ٣، سلێمانی.٢٠١٠

٣٧. تەبەری:مێژووی تەبەری، و زانەر محەمەد، چوار چرا سليمانی ٢٠١٠.

٣٨. علی صلابی:معاویەی کوری ئەبو سوفيان کە سايەتی و سەردەمی، و ئەبوبەکر لۆتەری، دارو المعريفه بيروت ٢٠١٣.

٣٩. نيشتيمان بەشير:کورد و سەلجوقييەکان، لێکۆڵينەوەيەك لە پەيوەندييە سياسييەکانيان (١٠٢٩–١٠٢٧)، چاپی دووەم.

٤٠. نقولو باربارو:الفتح الاسلامی للقسطتنطينةە، اليومات الحصار العثماني 1453 م، ترجمة د حاتم الطحاوي،2002.

٤١. الدكتور محمد مصطفى صفوت:سلطان محەمەد الفاتيح، فاتيح القسطنطينية، دار الفكر العربى،1948 .

42. http://mufidyuksel.com/fatihin-hocasi-seyhulislam-molla-gurani.html>
43. Vefa Kilise Camii (Molla Gürani Camii) Sürdürülebilir Turizm için Alternatif Tur Rotaları http://mufidyuksel.com/fatihin-hocasi-seyhulislam-molla-gurani.htm
44. Ahmed Ateş، Molla Gürani، İslam Ansiklopedisi،Ahmet Ates، Molla Gorani، Islam Ansiklopedisi، cilt 8 Istanbul، dorduncu baski، 1987
45. Doç. Dr. Sakıp Yıldız ; Fatih'in Hocası Molla Gürani ve Tefsiri، 1. Baskı، 1988.
46. Mefail HIZLI ; XIX. Yüzyıl Ortalarında Bursa Medreseleri ve Müderrislerine Yapılan Yıllık Ödemelere Dair Bir Belge. ULUDAĞ ÜNİVERSİTESİ İLÂHİYAT FAKÜLTESİ DERGİSİ Cilt:20، Sayı:1، 2011
47. İA، C.8 “Molla Gürani” ‘den sadeleştirerek، ilavelerle y ayına hazırlayan Erol KÖMÜR.
48. Murat ARSLAN İSTANBUL’UN ANTİKÇAĞ TARİHİ ; Klasik ve Hellenistik Dönemler، Birinci Baskı، Haziran 2010
49. Ord. Prof. İsmail Hakkı UZUNÇARŞILI :OSMANLI TARİHİ 1.، ANKARA 1988 Cilt
50. Fatih Sultan Mehmed ve Zamanı ، çeviren:Dost Körpe، Beşinci baskı:2003، İstanbul
51. NESÝMÝ YAZICI:Fâtih’in Yetiþmesi Üzerine Bazý Deðerlendirmeler، AÜÝFD XLVIII (2008)، sayý I
52. Hüseyin Tekinoğlu ; Fetih 1453 Ya İstanbul Beni Alacak Ya Ben İstanbulu، İstanbul 2012
53. Fatih Sultan Mehmed ve Zamanı ، çeviren:Dost Körpe، Beşinci baskı:2003، İstanbul
54. Zekerya BATUR; NASREDDİN HOCA FIKRALARINDA DEĞER YARGILARI VE EĞİTİM 2012، ANKARA-TURKEY
55. http://www.albayan.co.uk/Article2.aspx?id=2958
56. :http://www.alameli.net/article/158




وێنەی مەلا گۆرانی لە کاتی لاویەتی بە فلچەی وێنەکێش ( ڕێبوار خالید) کێشراوە (خەیاڵی ئەندێشەییە )

**سوپاس بۆهەر یەکە لە بەڕێزان:**

دکتۆر محمد قەرەداغی ، مامۆستا سەلام ناوخۆش، مامۆستا صەلاحەدینی ئەستەمبۆلْ، مامۆستا نیاز (مەستی)، مامۆستا ئیسماعیل تەها، دکتۆر تاریق،دکتۆر هاشم جاسم، زریان ئەحمەد، مامۆستا ڕێدار، کەمال عوسمان